# گۆنجاندن وهەلسەنگاندنا زانستی
## صدیق میرزا أمین

### وەرگێران وگونجاندن
صدیق میرزا أمین
بدرخان سلیمان میرخان
میرخان طاهر أمین

### پێداچوونا زمانی
مەجید محەمەد سەعید باجلۆری

### سەرپەرشتیێ چاپکرنێ
میرخان طاهر أمین
بدرخان سلیمان میرخان

# ناڤەرۆك

پەرتووکا خوێندکاری

# ناڤەرۆك

# ناڤەرۆك

# پێشەکی

## پێداچوونا پشکێ

هەر پێداچوونەکا پشکێ ڕاهێنانان بخوڤە دگریت بۆ هاریکاریکرنا تە دفێرکرنا تەیا زیندەزانییێدا ب ڕێیا پەرتووکا زیندەزانی. ڕاهێنانێن پێداچوونا پشکێ گرنگییێ ددەتە تێگەهێن سەرەکی وزاراڤێن بنەڕەتی دهەر بەندەکێ پەرتووکا تەدا. ئەڤ ڕاهێنانە یێن هاتینە دابەشکرن بۆ پشکێن خودانێن وان ژمارێن ڤەدگەرێین بۆ بەند وپشکێن پەرتووکا تە. زێدەباری ڤێ چەندێ پێداچوونا هەموو وان دەرئەنجامێن فێرکاری یا هاتیە کرن ئەوێن ددەستپێکا هەر پشکەکێ دپەرتووکا تەدا هاتین، ب ڕێیا ڕاهێنانێن پێداچوونا پشکان ئەوێن سەرب وانڤە.

### لێنێرینەکا گشتیا پێداچوونا پشکێ

دەمێ تو لسەر ڕاهێنانێن هەر کەرتەکی کار دکەی چوار جۆرێن ڕاهێنانا دێ هێنە پێشیا تە وێین ب سەر دوو لاپەراندا هاتینە دابەشکرن ودگرێداینە ب وان دەرئەنجامێن فێرکاریڤە ئەوێن دناڤ پەرتووکا خوێندکاریدا هەین، هەر جۆرەکێ ڕاهێنانان ناڤ ونیشانەکێ گۆنجای یێ هەی «پێداچوونا زاراڤان» یان «هەلبژارتنا بەرسڤێن ڕاست» یان «کورتە بەرسڤ» یان «پێکهاتن وفرمان» وئەوا دهێت وەسفەکا کورتە بۆ هەر جۆرەکێ.

**پێداچوونا زاراڤان** ئەو ڕاهێنانێن گرێدای ب زاراڤانڤە ب ئارمانجا پێداچوونا زاراڤێن سەرەکیێن هەر بەشەکی یێن دانایی، چێدبیت ژتە بخوازن بەراوردیەکێ یان جوداهیەکێ دناڤبەرا ڕامانا زاراڤاندا ئەنجامبدەی، یان نموونێن دیارکری لسەر زاراڤێن گشتییێن بەندی بینی، هەر وەکو ددیارن ل «کورتکرن/زاراڤ» ئەوێن ددویماهیا هەر بەندەکیدا هاتین.

**هەلبژارتن ژگەلەکان** پرسیارێن «هەلبژارتن ژگەلەکان» تێگەهەشتنا تە بۆ وان تێگەهـ وزاراڤێن هەر پشکەك پێشکێش دکەت تاقیدکەت. پرسیارێن «هەلبژارتن ژگەلەکان» چێدبیت ژتە بخوازن شێوێ پەیوەندی ب بەندیڤە هەی یان دەستنیشانکرنا وێڤە لێکبدەیڤە (شلۆڤە بکەی).

**کورتە بەرسڤ وهزرا ڕەخنەگری** «کورتە بەرسڤ» و «هزرا ڕەخنەگری» ڕێکێ بۆ تە خۆش دکەن پێزانینان ژبەندێ وەرگری دەمێ تو ڕاهێنان لسەر شارەزاییێن پەرتووکێ ئەنجامددەی. هەردەم پشکا «کورتە بەرسڤ» ب پرسیارەکا هزرەکا ڕەخنەگر یان پتر ب دویماهیك دهێت. ئەڤ پرسیارەنە وەکو پرسیارێن «هزرا ڕەخنەگرینە» ئەوێن دپێداچوونا پشکا وپێداچوونا بەنداندا هەین ددەقیدا.

**پێکهاتن وفرمان** ئەڤ پشکە چالاکیێن جۆراوجۆر بخوڤە دگریت، ژوانا ژی ب ناڤکرنا پێکهاتە وکریارێن سەرەکی وشلۆڤەکرنا داتایان یان وێنان. وئەوژی یێ هاتیە دیزاینکرن بۆ هاریکاریکرنا تە دکۆمکرنا هورکارییێن بەندیدا ب مەرەما پشکنینا ماددێن بەندی ب شێوەکێ بەرفرە.

## چەوا پێداچوونا پشکان دێ بکارئینی

پێداچوونێن پشکان وەکو ئامیرەکێ ب بها تو دشێی ب گەلەك رێکان بکاربینی. ب رێیا وێ پەرتووکا خوێندکاری ئەوا تایبەت ب تەڤە دێ تە ئاراستەکەت، ل دویڤ رێکا مامۆستاییێ تە دبەهرە بێژیا بابەتێ وێ زیندەزانیا تو دخوینی.

- دشیاندایە پشت ب پێداچوونا پشکێ ببەستن وەکو خواندنەکا پێشوەختا هەر پشکەکێ، وئەوژی هاریکاریا تە دکەت دپێناسەکرن وپێداچوونا تێگەهێن سەرەکیێن هەر بەندەکی بەری و ل دەمێ خواندنا تەیا دەستپێکێ یا هەر پشکەکێ.
- هەروەسان، تو دشێی پێداچوونێن پشکێ بکاربینی پشتی خواندنا هەر پشکەکێ بۆ تاقیکرنا وەرگرتنا (تێگەهەشتنا) تە بۆ تێگەهێن سەرەکیێن بەندی وزاراڤێن وی.
- ل دویماهییێ، تو دشێی لاپەرێن پێداچوونا پشکێ بکاربینی بۆ پێداچوونا وان ئەزموونێن بابەتێ زیندەزانییێ ئەوێن تو ئەنجامددەی ب چاڤ پۆشیکرن لسەر چەوانیا بکارئینانا تە وبکارئینانا مامۆستاییێ تە بۆ پێداچوونا پشکێ، ئەوژی دێ هاریکاریا تە کەت ددەستنیشانکرنا وان بابەتاندا ئەوێن تو ب شێوەیەکێ باش فێربووی، وبابەتێن پێدڤی ب ڤەکۆلینەکا زێدەتر هەی.

ناڤ ______________ پۆل ______________ بەروار ______________

**پێداچوونا پشکا 1-1**

# جیهانا زیندەزانییێ

**پێداچوونا زاراڤان:** بازنەکێ لدۆر وی زاراڤی بکێشە ئەوێ سەرب وێ کۆمەڵێڤە نەبیت، و ب کورتی ئەگەرێ وێ دیاربکە.

**1.** کریستاڵ، خانە، وزە، گەشە ______________

______________

**2.** زیندەپاڵ، ڕۆشنە پێکهاتن، کریارێن کیمیایی، فرەجۆریا زیندەیی ______________

______________

**3.** دابەشبوونا خانەیی، جوداهیا خانەی، ناڤەندێ ژناڤادا، گەشە ______________

______________

**4.** ناڤەرۆکا ئاڤێ، جوداکرن، زۆربوون، هەڤسەنگیا ژناڤدا ______________

______________

**5.** هێك، پیتێن، زیندەوەرێن تاك خانە، ڕڤشتێ (نڤشتێ) نوی ______________

______________

**هەلبژارتن ژگەلەکان:** دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤێسە.

______ **1.** زیندەزانی، زانستەکە تایبەتە ب خواندنا

**أ.** گیانەوەران.

**ب.** ڕووەك وگیانەوەران

**ج.** هەموو زیندەوەران.

**د.** ڤەگۆهاستنا وزێ.

______ **2.** تشتێن نەزیندی گەشە دکەن ب

**أ.** دابەشبوونا خانەیی.

**ب.** زێدەبوونا قەبارێ خانەیی.

**ج.** زێدەبوونا برِا وێ وزا بکاردئینیت.

**د.** کۆمبوونا گەلەك وان ماددێن ژێ پێکدهێن.

______ **3.** وێ کریارا تێدا خانە تایبەتمەند دبن دزیندەوەرێن فرەخانەدا دبێژنێ:

**أ.** توخمە زۆربوون

**ب.** ناتوخمە زۆربوون

**ج.** ڕۆشنە پێکهاتن

**د.** جیاوازبوون

______ **4.** ئێکێ ژڤانان پەیوەندیا ب هەڤسەنگیا ژناڤداڤە یا هەی.

**أ.** ڕێکخستنا پێکهاتێن خانێ.

**ب.** پێکهاتا ڕێکخستیا کریستالان.

**ج.** ئاستێ جێگیرێ کاودانێن ژناڤدا یێ زیندەوەری.

**د.** گوهۆرینا کاودانێن ژناڤدا یێن زیندەوەری.

ناڤ ________________ پۆل ________ بەروار ________

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

1. بناڤکرنا خانێ بۆ یەکا بنەڕەتیا ژیانێ چ دگەهینیت ڕوونبکە. ________________

________________

2. بۆچی زیندەوەران پێدڤی ب وزێ هەیە؟ ________________

________________

3. شەش تایبەتمەندیێن زیندەوەران بێژە. ________________

________________

4. چ جوداهی هەیە دناڤبەرا گەشە وپەرەسەندنێدا ل دەڤ زیندەوەرێن فرەخانە؟ ________________

________________

5. ئەرێ زۆربوون یا پێدڤیە بۆ مانا زیندەوەری ب تاکی (بتنێ) ب زیندی؟ بۆچی؟ ________________

________________

6. **هزرەکا ڕەخنەگر** ڕێکخستنا کریستالێن خوێ گەلەك ب ساناهیترە ژڕێکخستنا زیندەوەران. ئەو پیڤەرێن دی چنە یێن هاریکاریا ژێکجوداکرنا کریستالێن خوێ ژزیندەوەران دکەن؟ ________________

________________

________________

________________

**پێکهاتن وفەرمان**: ڕوونبکە چەوا وێنێ هێلکاریێ خوارێ تایبەتمەندیێن ژیانێ دنوێنیت.



ناڤ ________________ پۆل ________________ بەروار ________________

**پێداچوونا پشکا 1-2**

# پرۆگرامێ زانستی

**پێداچوونا زاراڤان:** ڤان زاراڤێن خوارێ پێناسە بکە.

**.1** داتا ________________

**.2** وەرگرتنا نموونان ________________

**.3** گوهۆڕێ پاشکۆ ________________

**.4** گوهۆڕێ سەربەخۆ ________________

**.5** بیردۆز ________________

**هەلبژارتن ژگەلەکان:** دناڤ بۆشاییدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤیسە.

______ **.1** ئەو زانایێ زیندەزانی ئەوێ ڤەکۆلینێن مەیدانی لسەر ڕەفتارێ بالندان ل دارستانا بارانا وی ئەنجامدددەت، ڕادبیت ب کۆمکرنا داتایان ب ڕێیا:
- **أ.** تاقیکرنێ
- **ب.** تێبینیکرنێ
- **ج.** چێکرنا نموونەکێ
- **د.** بەلگەئینانێ

______ **.2** دروستکرنا وێنەکێ داتایی نموونەکە لسەر:
- **أ.** کریارا پیڤانێ
- **ب.** ڕێکخستنا داتایان
- **ج.** تێبینی
- **د.** پێشبینی

______ **.3** دوماهیك پێنگاڤ ژپێنگاڤێن خوارێ یێ پرۆگرامێ زانستی پێنگاڤا:
- **أ.** تاقیکرتنیە
- **ب.** تێبینیکرتنیە
- **ج.** چێکرنا نموونێیە
- **د.** دانانا مگرتیێیە

______ **.4** ئەو شێوازێ تێبینیان ڕووندکەت ودشیاندایە بهێتە تاقیکرن دبێژنێ:
- **أ.** مگرتی
- **ب.** بەلگەئینان
- **ج.** بیردۆز
- **د.** نموونە

______ **.5** ڕوونکرنا بیردۆزێ، یان بیرکاری یا داتا (سامپل) پالپشتیا وان دکەن:
- **أ.** مگرتی
- **ب.** بەلگەئینان
- **ج.** بیردۆز
- **د.** نموونە

ناڤ ______________ پۆل ______________ بەروار ______________

**بەرسڤا كورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**1.** داتایێن بری چنە؟ دوو نموونان بۆ داتایێن بری بینە. ______________

______________

**2.** دوو سەخلەتان بێژە پێدڤیە دنموونێدا هەبن دەمێ ب شێوەكێ دروست (هویرك) نواندنا كۆمەڵەكا زیندەیی بكەن. ______________

______________

**3.** چ پەیوەندی هەیە دناڤبەرا مگرتیێ وپێشبینیێ وتاقیكرنێدا؟ ______________

______________

**4.** ئەو چ كارن یێن زانا دشێت پێ ڕاببیت دەمێ داتایان شلۆڤە دكەت؟ ______________

______________

**5.** **هزرەكا ڕەخنەگر** زانایەكی دڤیا ڤەكۆلینا كاریگەریا دەرمانی لسەر پەستانا خوینا جوردان ئەنجامبدەت، ئەڤجا نەخشەسازیا تاقیكرنەكێ دانا تێدا كۆمەلا تاقیكری پێكدهات ژوان جوردێن ب گیراوی خوییێ دەرمان تێدا هاتینە كۆتاندن. پێدڤیە كۆمەلا كۆنترۆلكری ژ چ پێكهاتبیت؟ ______________

______________

**6.** گوهۆڕی سەربەخۆ وگوهۆڕێ پاشكۆ دتاقیكرنا وێدا چ بوون؟

______________

**پێكهاتن و فرمان وێنێ بومێ بپشكنە ودناڤ ئێكێ ژ ڤان ڤالاهیێن خوارێدا ان تێبینیان بنڤیسە یێن پاڵپشتیا ئەو بەڵگێن هەین بكەن، وبەڵگێن تێبینیێن هەین بنڤیسە.**

| **تێبینی** | **دەرئەنجام**: |
|---|---|
| ______________ | بوم لسەر دارادا دژیت |
| ______________ | بوم لسەر مشكان دژیت |
| ______________ | بوم ب هاریكاریا پەنجرۆكێن خۆ تێچیرا خۆ دكۆژیت |
| بومێ چەنگێن هەین | ______________ |
| هەردوو چاڤێن بومێ دكەڤنە لایێ پێشیێ یێ ڕوویێ وی | ______________ |
| دەمێ شەڤێیە | ______________ |

ناڤ ________________ پۆل ____________ بەروار ____________

پێداچوونا پشکا 3-1

# هویربین وپیڤان

**پێداچوونا زاراڤان**: بازنەکێ لدۆر وی زاراڤی بکێشە ئەوێ سەربووی کۆمەلێڤە نەبیت، و ب کورتی ئەگەرێ وێ دیاربکە.

1. هویربینی (مایکرۆسکۆپ) رووناهیێ یا ئاوێتە، هویربینا ئەلکترۆنیا تێپەڕ، هویربینا ئەلکترۆنیا پشکنەر.

________________________________

2. یەکا بنەڕەتی، ستێج (مێز)، پەپکێ زڤرۆك، تەنە هاوێنە ________________

________________________________

3. مەزنکرن، شیانا مەزنکرنێ، ژێکجوداکرن، چڕیا بارستەی ________________

________________________________

4. چرکە، خولەك، مەتر، کیلۆگرام ________________

________________________________

5. مەتر، مەترا دووجا، مەترا سێجا، کیلۆگرام لسەر مەترێن سێجا ________________

________________________________

**هەلبژارتن ژگەلەکان**: دناڤ بۆشاییا پیتا بەرسڤا دروست بنڤیسە.

______ 1. شیانا هویربینێ بۆ دیارکرنا هورکاریان ب ڕوون وئاشکرایی دبێژنێ:
 أ. زێدەکرنا قەبارەی  ج. بچووککرن
 ب. مەزنکرن  د. ژێکجوداکرن

______ 2. ئێك ژوان دیاردێن سنورەکی بۆ بکارئینانا هویربینا ئەلکترۆنیا پشکنەر ددانیت نەشیانا بکارئینانا وێیە د:
 أ. پشکنینا نموونێن بچووکتر ژقەبارێ خانان.
 ب. دیتنا نموونێن (سامپلێن) زیندی.
 ج. دیارکرنا وێنەکێ مەزنکریێ نموونێ.
 د. دیارکرنا وێنەکی ژڕوویێ نموونێ.

______ 3. ئەو هویربینا هاوێنا چاڤییا X 10. وتەنە هاوێنا X 25 هەین شیانا مەزنکرنا وێیا گشتی یەکسانە.
 أ. X2.5  ج. X 250.
 ب. X35  د. X2,500

______ 4. یەکا بنەڕەتیا سیستەمێ جیهانیێ یەکان سەبارەت دەمی ئەڤەیە.
 أ. چرکە  ج. دەمژمێر
 ب. خولەك  د. ڕۆژ

______ **5.** پێشگرا تایبەتا سیستەمێ جیهانێ یەکان یا کو هزار جارا بۆ یەکا بنەڕەتی دنوێنیت ئەڤەیە:

**أ.** دیسی　　　　**ج.** کیلۆ

**ب.** سەنتی　　　　**د.** مایکرۆ

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**1.** ڤان بەشێن خوارێ ب وێ ڕێزبەندێ دانە یا دگەل چوونا ڕووناهییێ دناڤ هویربینا ڕووناهییێدا بگونجیت:
نموونە، هاوێنا چاڤی، هاوێنا تەنی، بۆری، ژێدەرێ ڕووناهییێ ______________________________

______________________________

**2.** بلندترین پلا مەزنکرنێ یا ڤان چەندە؟ هویربینا ڕووناهییێ، هویربینا ئەلکترۆنی تێپەڕ، هویربینا ئەلکترۆنی پشکنەر. ______________

______________________________

**3.** هێمایا کورتکرنا هەر ئێکێ ژ ڤان یەکێن خوارێ بنڤێسە: مەتر، کیلۆمەتر، سەنتیمەتر، میلیمەتر، مایکرۆمەتر، چ پەیوەندیا بیرکاری دناڤبەرا ڤان یەکانا هەیە؟ ______________________________

______________________________

**4.** **هزرەکا ڕەخنەگر** میتەکا زانایان دڤێت وێ بەکتریایێ بنیاسن یا ب ڤەکۆلینا وێ ڕابدن: ئەرێ دناڤ بەکتریاییێدا ڤایرۆس هەنە؟ پێدڤیە ئەو کێژ هویربینێ بکاربینن؟ بەرسڤا خۆ ڕوونبکە. ______________________________

______________________________

______________________________

**پێکهاتن و فرمان**: ناڤێ هەر بەشەکی ژ ڤی وێنێ هێلکاریێ خوارێ بنڤێسە.

أ ______________________________

ب ______________________________

ج ______________________________

د ______________________________

ه ______________________________

و ______________________________

ناڤ ______________ پۆل ______________ بەروار ______________

**پێداچوونا پشکا 1-2**

# کارلێکێن کیمیایی و وزە

**پێداچوونا زاراڤان: چ جوداهی هەیە دناڤبەرا زاراڤێن تێگەهێن ڤان جووتێن خوارێدا.**

**1.** وزا سەربەست، وزا چالاککەر ______________

______________

**2.** کارلێکا دەرکەرا وزێ، کارلێکا مێژەرا وزێ ______________

______________

**3.** کارلێکا ئۆکسانێ، کارلێکا ژێڤەکرنێ ______________

______________

**هەلبژارتن ژگەلەکان: دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤێسە.**

______ **1.** ئەنزیم

**أ.** بڕا وزا بەرهەمهاتی ژکارلێکێ زێدە دکەت.

**ب.** بڕا وزا بەرهەمهاتی ژکارلێکێ کێم دکەت.

**ج.** بتنێ کارلێکێن دەرکەرێن وزێ هاندەدەت.

**د.** وزا چالاککەرا پێتڤی بۆ کارلێکەکێ کێم دکەت.

______ **2.** کارلێکێن ئۆکسان وژێڤەکرنێ

**أ.** ڕامانا وێژی ئۆکسانە یان ژێڤەکرنە، نەکو هەردوو پێکڤە.

**ب.** ڤەگۆهاستنا ئەلکترۆنان دناڤبەرا گەردیلاندا بخۆڤە دگریت.

**ج.** دزیندەوەراندا ڕوودەدەت.

**د.** هەردەم گرنگییێ ددەتە ئۆکسجینێ.

______ **3.** دەمێ ئاڤ ژێکڤە دبیت هەردەم ئێك ژڤانان دروست دبیت.

**أ.** ئایۆنێن $H^+$ و $H_2O$

**ب.** ئایۆنێن $H^+$ وئایۆنێن $OH^-$.

**ج.** ئایۆنێن $H^+$ وئایۆنێن $H_3O^+$

**د.** ئایۆنێن $OH^+$ وئایۆنێن $H_3O^-$.

______ **4.** ترش گیراوەکە برەکا زۆرا ڤی یا تێدا هەی.

**أ.** ئایۆنێن هایدرونیۆمی، بەرامبەر ئایۆنێن هایدرۆکسیدی.

**ب.** ئایۆنێن هایدرۆکسیدی، بەرامبەر ئایۆنێن هایدرۆنیۆمی.

**ج.** ئایۆنێن سۆدیۆمی، بەرامبەر ئایۆنێن هایدرۆکسیدی.

**د.** ئایۆنێن هایدرۆکسیدی، بەرامبەر ئایۆنێن سۆدیۆمی.

______ **5.** کیژك ژڤان ماددێن خوارێ تفتە؟

**أ.** ئاڤا پاقژ

**ب.** سیهك

**ج.** ئەمۆنیا

**د.** میز

ناڤ ______________ پۆل ______________ بەروار ______________

______ **.6** ئەو گیریگاوێ ژمارا هایدرۆجینێ وی ژ 7 ی پتر گیرێکی:

**أ.** پیچەکێ ترشە **ج.** ترشە

**ب.** هاوتایە **د.** تفتە

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**.1** دکارلێکا کیمیاییا خوارێدا پیتا «ك» لسەر ماددێن کارلێککری بنڤیسە وپیتا «ب» لسەر ماددێن بەرهەمهاتی بنڤیسە.

$$C_6H_{12}O_6 + C_6H_{12}O_6 \longleftarrow H_2O + C_{12}H_{22}O_{11}$$

**.2** ئەو چ رووله ماددێن هاندەر پێ رادبن دکارلێکێن کیمیاییدا؟ ______________

______________

______________

**.3** جووت تیراسە ئاماژێ ب چ ددەت دکارلێکا کیمیاییدا؟ ______________

______________

**.4** **هزرەکا رەخنەگر** سوکەرۆز، شەکرا خوارنێ دشێت دگەل ئاڤێ تێکبگریت داکو دوو ئاوێتێن دی پێکبینیت ئەوژی گلۆکۆز وفرەکتۆزن، لێ دەمێ شەکرێ دکەنە سەر کوپەکێ ئاڤێ، ئەڤ کارلێکە ب شێوەکێ گەلەك سنوردار رووددەت، بۆچی ئەڤ کارلێکە هێدی رووددەت؟ ئەم پێدڤی چینە بۆ بلەزئێخستنا ڤێ کارلێکێ؟ ______________

______________

______________

______________

______________

**پێکهاتن وفرمان وێنێ داتاییێ خوارێ بکاربینە بۆ بەرسڤدانێ لسەر پرسیارێن خوارێ.**

ئەڤ وێنێ داتاییێ وان گوهۆرینێن وزێ دنوێنیت یێن دگەل پێشکەفتنا کارلێکا کیمیای رووددەت.




**.1** تیراسێ «أ» ئاماژێ ب چ ددەت؟ ______________

**.2** تیراسێ «ب» ئاماژێ ب چ ددەت؟ ______________

**.3** ئەڤ کارلێکە مژەرا وزێیە یان دەرکەرا وزێیە؟ بەرسڤا خۆ روونبکە. ______________

______________

**پێداچوونا پشکا 2-2**

# ئـــــاڤ

**پێداچوونا زاراڤان**: ڤان زاراڤێن خوارێ پێناسە بکە.

**.1** ئاوێتێ جەمسەرگر ____________

**.2** بەندا هایدرۆجینی ____________

**.3** پێکڤەنیسیان ____________

**.4** پێکڤەگرێدان ____________

**هەلبژارتن ژگەلەکان**: دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤیسە.

____ **.1** دگەردا ئاڤێدا دێ

**أ.** هەموو گەردیلە پشکەیی دێ دموجەب (پۆزەتیڤ) بن.

**ب.** گەردیلا ئۆکسجینی پشکەیی دێ بارگا وان یا سالب بیت وهەردوو گەردیلێن هایدرۆجینی پشکەیی دێ بارگا وان یا موجەب بیت.

**ج.** گەردیلا ئۆکسجینی پشکەیی دێ بارگا وی یا موجەب بیت وهەردوو گەردیلێن هایدرۆجینی پشکەیی دێ بارگا وان یا سالب بیت.

**د.** هەموو گەردیلە پشکەیی دێ دسالب بن.

____ **.2** دەمێ کلۆریدی سۆدیۆم یێ حەلیای دناڤ ئاڤێدا، دێ ئایۆنێن سۆدیۆمی:

**أ.** بەرەڤ گەردیلێن ئۆکسجینێ ئاڤێ هێنە ڕاکێشان.

**ب.** بەرەڤ گەردیلێن هایدرۆجینێ ئاڤێ هێنە ڕاکێشان.

**ج.** بەرەڤ ئێك دوو دێ هێنە ڕاکێشان.

**د.** ژکلۆریدێ سۆدیۆمیڤە نابن (جودا نابن).

____ **.3** بەندێ هایدرۆجینی

**أ.** دناڤبەرا گەردیلێن هایدرۆجینیدا پێکدهێت دگەردێن جودا دا.

**ب.** بەندێن بهێزن.

**ج.** گەردێن ئاڤێ پێکڤە گرێددەت.

**د.** گەردیلێن هایدرۆجینی پێکڤە گرێددەت، دگەردەکا گازا هایدرۆجینیدا.

____ **.4** دەمێ کوپەکێ تژی ئاڤ دکەین هەتا لێڤێ، ل ڕەخێن کۆپی دێ ئاڤ یا کود (قوف) بیت.

**أ.** تایبەتە مووین. **ج.** پێکڤە نیسیان.

**ب.** گەرمی وزە. **د.** پێکڤە گرێدان.

____ **.5** دەمێ ئاڤا شل دهێتە گەرمکرن، پتریا وێ وزا دبنەڕەتدا مێژتی دهێتە بکارئینان د:

**أ.** بلندکرنا پلا گەرمیا ئاڤێ

**ب.** ژێکڤەکرنا (هەلۆەشاندنا) بەندێن هەڤپشك دناڤبەرا گەردیلێن هایدرۆجینی وئۆکسجینی دئاڤێدا.

**ج.** کەلاندنا ئاڤێدا.

**د.** هەلۆەشاندنا بەندێن هایدرۆجینی دناڤبەرا گەردێن ئاڤێدا.

ناڤ ____________________ پۆل ____________ بەروار ____________

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**1.** بۆچی ئاڤ ب حەلکەرەکێ (تویێنەوەرەکێ) باش دهێتە وەسفکرن؟ ____________________

____________________

**2.** جورێن وان ماددان چنە؟ ژوان ژی ئاڤ، یێن دشێن گرنگیێ بدەنە بەندێن هایدرۆجینی؟ ____________________

____________________

**3.** ئەو سەخلەتا ئاڤێ چییە یا رێکێ ددەتێ ب روویەکێ هشکڤە بنسییێت وەکو روویەکێ داری؟ ____________________

____________________

**4.** چەوان ئاڤ بەشداریێ دکەت دپاراستنا خانانێدا لسەر پلا گەرمیەکا یەکسان هەر چەندە پلا گەرمیا دەوروبەر دهێتە گوهارتن. ______

____________________

**5.** **هزرەکا رەخنەگر** ئەگەرێ وێ چەندێ روونبکە بۆچی ئاڤ دەمێ ژحەنەفیەکێ دهێتە خوار دلوپێن مەزنێن خر پێکدئینیت؟ ______

____________________

**6.** **هزرەکا رەخنەگر** پتریا جاران ئاڤ ب حەلکەرەکێ گشتی دهێتە وەسفکرن، چونکی هەموو ماددێن لەشێن زیندی دحەلینیت. تو چ ژسروشتێ وان ماددان دەرئەنجام دکەی (دئینیەدەر)؟ ____________________

____________________

**پێکهاتن و فرمان**: **وێنەی هێلکاریێ خوارێ گەردەکا ئاڤێ دنوینیت. ل نێزیکی وێ سێ گەردێن دیێن ئاڤێ وێنە بکە، وهێلێن ژێکڤەقەتیانا بکاربینە بۆ ئاماژەکرنێ ب وێ جهێ یێ بەندێن هایدرۆجینی لێ دروست دبن دناڤبەرا ڤێ گەردێ و وان گەردێن تە وێنە کرین.**




**گەردا ئاڤێ**

ناڤ ______________ پۆل ______________ بەروار ______________

**پێداچوونا پشکا 3-2**

# ئاوێتێن کاربۆنی

**پێداچوونا زاراڤان**: ڤان زاراڤێن خوارێ پێناسە بکە ونموونەکێ بۆ هەر ئێکێ ژوان بینە.

**1.** ئاوێتێ ئەندامی ______________________________________________

______________________________________________

**2.** کۆمەڵا فرمانی ______________________________________________

______________________________________________

**3.** کحۆل ______________________________________________

______________________________________________

**4.** یەکا پێکهاتنێ ______________________________________________

______________________________________________

**5.** فرەیەکێن پێکهاتنی ______________________________________________

______________________________________________

**هەلبژارتن ژگەلەکان**: دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤێسە.

______ **1.** ئاوێتێن ئەندامی ئەڤە پێن تێدا هەین.

**أ.** کاربۆن، وئاسایی توخمێن دی.

**ب.** گەلەك جۆرێن توخمان ژبلی کاربۆنی.

**ج.** کاربۆن بتنێ.

**د.** کاربۆن وهایدرۆجین بتنێ.

______ **2.** ژمارا وان بەندێن کاربۆنی یا گەردیلەکا کاربۆنی بتنێ بشێت دگەل گەردیلێن دی پێکبینیت ئەڤەیە.

**أ.** 1. **ب.** 2. **ج.** 4. **د.** 8.

______ **3.** ئەو بەندێن هەڤپشکێن پێکدهێن دەمێ دوو گەردیلە دجووتەکێ ئەلکترۆناندا هەڤپشکدبن دبێژنێ.

**أ.** تاکە بەند **ج.** جووتە بەند

**ب.** بەندا سیانی **د.** چوارینە بەند

______ **4.** ژێکڤەکرنا فرە یەکێن پێکهاتنێ ڤێ بخۆڤە دگریت.

**أ.** شیتەڵبوون ب ئاڤێ **ج.** کارلێکا چڕبوونەوە.

**ب.** ژێکڤەکرنا بەندێن هایدرۆجینی. **د.** ژێکڤەکرنا (هەڵوەشاندا) بەندێن ئایۆنی.

______ **5.** ئەدینۆسینێ سێ فۆسفاتی وزێ دەردئێخیت دەمێ.

**أ.** کارلێکەکا چڕبوونەوە چێدبیت. **ج.** کۆمەڵا هایدرۆکسیلیێ لسەر زێدە دبیت.

**ب.** کۆمەڵا فۆسفاتی لسەر زێدە دبیت. **د.** کۆمەڵا فۆسفاتی بەرزە دکەت.

ناڤ ______________________ پۆل ______________ بەروار ______________

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**1.** چەوا کۆمەلا فرمانی کار دکەتە سەر تایبەتمەندیێن ئاوێتەکێ ئەندامی؟ نموونەکێ بۆ بینە. ______________________

______________________

**2.** لدویڤ قەبارەی ئەڤێن خوارێ رێز بکە ژبچووکی بۆ مەزنی: فرە یەکێن پێکهاتنێ، یەکا پێکهاتنێ، گەردیلا کاربۆنی، گەردەکا زۆر مەزن. ______________________

______________________

**3.** ڕوونبکە چەوا گەردەکا ئاڤێ دروستدبیت دەمێ گلۆکۆز وفرەکتۆز دکەڤنە بن کارلێکا چڕبوونەوەدا. ______________________

______________________

**4.** دەمێ ئەدینوسینێ سێ فۆسفاتی ب ئاڤێ شیتەلدبیت ئەو ماددێن ژێ بەرهەمدهێن چنە؟ ل دەمێ کارلێکێ زێدەباری وان ماددان چ تشت ژێ دهێتە دەرێخستن؟ ______________________

______________________

**5.** **هزرەکا ڕەخنەگر** چەوان جۆراوجۆری دئاوێتێن ئەندامیدا دشێت یا جودا بیت دەمێ ئاستێ دەرڤەیێ وزا کاربۆنی حەفت ئەلکترۆن بن شینا چواران. ______________________

______________________

______________________

**پێکهاتن وفرمان**: وێنێ خوارێ بکاربینە بۆ بەرسڤدانێ لسەر پرسیارێن سەرب ویڤە.

دروستبوونا سوکەرۆزی ژگلۆکۆزی وفرەکتۆزی ب ڕێیا ڤێ کارلێکا کیمیاییا دیار دوێنەیدا یا هاتیە دیارکرن. تێبینیکە ئەڤ کارلێکە دهەر ئاراستەیەکیدا چێدبیت ڕوودبدەت.

سوکەرۆز    فرەکتۆز    گلۆکۆز

**1.** ماددێن کارلێککری وماددێن بەرهەمهاتی دوێ کارلێکا ژڕاستێ بۆ چەپێ ڕوودەدەت چنە؟ ______________________

______________________

**2.** ئەرێ ئەڤ کارلێکە چڕبوونەوەیە یان شیتەلبوونە ب ئاڤێ؟ ______________________

**3.** ماددێن کارلێککری وماددێن بەرهەمهاتی دئاراستێ پێچەوانەیێ کارلێکێدا چنە؟ ______________________

______________________

**4.** ئەرێ کارلێکا پێچەوانە چڕبوونەوەیە یان شیتەلبوونە ب ئاڤێ؟ ______________________

ناڤ ________________ پۆل ________________ بەروار ________________

**پێداچوونا پشکا 4-2**

# گەردێن ژیانێ

**پێداچوونا زاراڤان**: ڤان زاراڤێن خوارێ پێناسە بکە ونموونەکێ بۆ هەر ئێکێ ژوان بینە.

**1.** تاکە شەکر، و فرە شەکر ________________

________________

**2.** حەژێکەرێ ئاڤێ، نە حەژێکەرێ ئاڤێ ________________

________________

**3.** نیۆکلیۆتاید، ناڤکە ترش ________________

________________

**هەلبژارتن ژگەلەکان**: دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤیسە.

______ **1.** گلایکۆجین، نیشاستە، سلیلۆز

**أ.** تاکە شەکر.

**ب.** جووتە شەکر.

**ج.** فرە شەکر.

**د.** شەکرێن سادە.

______ **2.** شێوە وفرمانێن جودا یێن سەرب پرۆتینێن جوداڤە ئێکێ ژڤان دەستنیشان دکەت.

**أ.** کۆمەلێن Rێن وان ترشێن ئەمینی یێن تێدا هەین.

**ب.** کۆمەلێن ئەمینییێن وان ترشێن ئەمینی یێن تێدا هەین.

**ج.** کۆمەلێن کاربۆکسیلییێن وان ترشێن ئەمینی یێن تێدا هەین.

**د.** هەبوون یان نەبوونا چ ترشێن ئەمینی.

______ **3.** پترپیا ئەنزیمان

**أ.** دهێنە گوهارتن ب کارێ وان کارلێکان یێن ڕادبن ب هاندانا وان.

**ب.** وزا چالاککرنا وان کارلێکان زێدە دکەت یێن ڕادبن ب هاندانا وان.

**ج.** بەندێن کیمیای دماددێن کارلێککریدا ب هێز دئێخیت.

**د.** یا هەستیارە بەرامبەر گوهۆڕینێن پلا گەرمیێ یان ژمارا هایدرۆجینی.

______ **4.** ژمارەکا زۆرا بەندێن کاربۆنیێن – هایدرۆجینی دچەوریاندا.

**أ.** وەلێدکەت چەوری دجەمسەرگربن.

**ب.** پتر وزێ کۆم دکەن، زێدەتر ژوێ یان بەندێن کاربۆنیێن – هایدرۆجینی دئاوێتێن ئەندامییێن دیدا کۆم دکەن.

**ج.** وەدکەن چەوری دئاڤێدا ب حەلیێن.

**د.** دکۆمەلا کاربۆکسیلیدا یێن هەین ل ڕەخێ چەوریڤە.

ناڤ ______________________________ پۆل ______________ بەروار ______________

______ **5.** کاری ژهەمیا گرنگتری ناڤکە ترشان ئەڤەیە.
**أ.** هاندانا کارلێکێن کیمیایی.
**ب.** پێکئینانا بەربەستەکی (دیوارەکی) دناڤبەرا ناڤ خانێ و دەرڤەی ودێدا.
**ج.** کۆمکرنا وزێ.
**د.** کۆمکرنا پێزانینێن پەیوەندی ب بۆماوی و دروستکرنا پرۆتینانڤە هەی.

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**1.** شێوێ کۆمکرنا وزا بلەز کاربۆهیدراتی ل دەڤ گیانەوەران یێ چەوانە؟ وچەوان ئەڤ شێوە ژلایێ پێکهاتنێڤە پێکڤە دهێنە گرێدان؟ ______________________________

______________________________

**2.** چەند جۆرێن یەکێن پێکهاتنێ دناڤ نیشاستەیدا هەنە؟ ______________________________

چەند جۆرێن یەکێن پێکهاتنێ دناڤ پرۆتینیدا هەنە؟ ______________________________

**3.** ئەو چ ئاوێتەیە پتریا پەردا خانێ پێکدئینیت؟ ______________________________

______________________________

چاوا ئەڤ ئاوێتە دگەل فرمانێ پەردێ دگونجیت؟ ______________________________

______________________________

**4.** ئەو چ جۆرێ گەردێیە یێ ستیرویدژ پێکدهێنن؟ ______________________________

______________________________

دوو نموونان لسەر ستیرویدان بینە. ______________________________

**5.** **هزرەکا ڕەخنەگر**: ئەو مێرووێن لسەر هشکاتی دژین لسەر ڕوویێ ژدەرڤەیێ لەشێ وان بەرگەکێ کایتینی (شەمایی) یێ هەی. ئەو چ کارە کو چێدبیت کایتین پێ ڕابیت ل دەڤ وان گیانەوەران؟ ______________________________

______________________________

**پێکهاتن وفرمان**: بۆ هەر بەشەکی ژوێنەی ناڤەکی دانە دناڤ ڤالاهییێن «أ، ب، ج، د».
ئەڤ وێنە کارلێکێ دناڤبەرا ئەنزیمی وماددێ کارلێککەردا دیار دکەت ل دەمێ کارلێکەکا کیمیاییدا.



ناڤ ______________ پۆل ______________ بەروار ______________

**پێداچوونا پشکا 1-3**

# دەستپێکەك بۆ خانێ

**پێداچوونا زاراڤان:** ڤان زاراڤێن خوارێ پێناسە بکە.

1. ئەندامۆچکە ______________

2. ناڤك ______________

3. زیندەوەرێ ناڤك ڕاستەقینە ______________

4. زیندەوەرێ ناڤك سەرەتایی ______________

**هەلبژارتن ژگەلەکان:** دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤیسە.

______ **.1** ئێك ژوان بەلگێن کەڤنێن پالپشت بۆ بیردۆزا خانەیی تێبینیکرنا:
- **أ.** بتنێ رووەك ژخانان پێکدهێن.
- **ب.** بتنێ گیانەوەر ژخانان پێکدهێن.
- **ج.** خانە ژدابەشبوونا خانێن دی پەیدا دبن.
- **د.** خانێن گیانەوەری ژدابەشبوونا خانێن روەکی پەیدا دبن.

______ **.2** خانان قەبارەکێ دیارکری هەیە ژبەر:
- **أ.** تێکراییا چوونەژوورا ماددێن پێتڤی بۆ خانێ کو خانە ڕێ ددەتێ بۆ چوونەژوورێ ب ڕێکا پەردا وێ.
- **ب.** تێکراییا ڕابوونا خانێ ب بەرهەمئینانا پێزانینێن بۆماوەیی.
- **ج.** برا وان ماددان یێن خانە دشێت کۆمبکەت دا پێ تژی ببیت.
- **د.** برا پەردا خانێ ئەوا خانە دشێت بەرهەمبینیت.

______ **.3** تیرێ پتریا خانێن رووەکی وگیانەوەری دناڤبەرا:
- **أ.** 0.1—0.2 مایکرۆمەتر
- **ب.** 1-2 ملیمەتر.
- **ج.** 10-50 مایکرۆمەتر.
- **د.** 10-50 ملیمەتر.

______ **.4** ئەو تایبەتمەندیا دەمارە خانێ یا ئێکسەر ب فرمانێ وێڤە گرێددەت، وەرگرتن وهنارتنا دەمارە ڕاگەهاندنییە ب ڕێکا:
- **أ.** دەرپەڕیوێن درێژێن وێ.
- **ب.** شێوێ وێ یێ تەخت.
- **ج.** شیانا وێ بۆ گوهۆڕینا شێوێ خۆ.
- **د.** شیانا وێ بۆ داعیران وتێکشکاندنا بەکتریا.

______ **.5** ئێك ژجوداهییێن سەرەکی دناڤبەرا خانێن ناڤك ڕاستەقینە وخانێن ناڤك سەرەتایی ئەوە کو:
- **أ.** خانێن ناڤك سەرەتایی ب پەردا خانەیی دەوردایە.
- **ب.** خانێن ناڤك سەرەتایی ناڤك یا هەی.
- **ج.** خانێن ناڤك ڕاستەقینە پێزانینێن بۆماوەیی یێن هەین.
- **د.** خانێن ناڤك ڕاستەقینە ئەندامۆچکێن ب پەردا دەوردای هەنە.

ناڤ ______ پۆل ______ بەروار ______

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**1.** هەرسێ بەندێن بیردۆزا خانەیێ بێژە. ______

**2.** شیانا خاناسپیا خوینێ بۆ گوهۆڕینا شێوێ خۆ چەوا کارتێکرنێ لسەر فرمانێن وێ دکەت. ______

**3.** وەکهەڤی دناڤبەرا ئەندامۆچکێن خانەکێ وئەندامێن زیندەوەرەکێ فرە خانە چ دیار دکەت؟ ______

**4.** دوو ژجوداکەرێن خانێن ناڤك ڕاستەقینە بێژە کو لدەڤ خانێن ناڤك سەرەتایی نەبن. ______

**5.** **هزرەکا ڕەخنەگر**: دەمێ تیرێ خانەکا گۆیی زێدەبیت ژ 2 مایکرۆمەتران بۆ 20 مایکرۆمەتران، ژمارا دووهێندبووی یا ڕووبەرێ ڕوویێ وێ دگوهۆڕیت چەندە؟ ژمارا دووهێندبووی یا قەبارێ وێ دگوهۆڕیت چەندە؟
«ڕووبەرێ ڕووی بۆ گۆیەکێ = $\pi$ 4 × نت$^2$ ، قەبارێ گۆیێ ≡ $\pi \frac{4}{3}$× نت$^3$ ، ل بیرا تەبیت کو تیرە ≡ 2 × نت»

______

## پێکهاتن وفرمان

**1.** ئەڤ هەردوو وێنێن هێلکاری نوانندنا خانەکا ناڤك ڕاستەقینە وخانەکا ناڤك سەرەتایی دکەن. جۆرێ هەر ئێك ژوان دڤالاهیێن «أ،ب» دا بێژە.

ج ______ د ______

ب ______ أ ______

**2.** دوو جوداکارا بێژە کو دبنە بناغە بۆ نیاسینا ڤان خانان ______

**3.** ئەو پێکهاتێن ب پیتێن «ج ، د» ئاماژە پێ هاتیە کرن پێناسە بکە. ______

ناڤ ______________________ پۆل ______________ بەروار ______________

**پێداچوونا پشکا 2-3**

# بەشێن خانا ناڤك ڕاستەقینە

**پێداچوونا زاراڤان: جوداهیێ د ناڤبەرا زاراڤ وتێگەهێن د ڤان جووتاندا دیار بکە.**

**.1** پرۆتینێ لایی، پرۆتینێ نقوومبووی ______________________

______________________

**.2** سایتۆپلازم وسایتۆسۆل ______________________

______________________

**.3** کۆلك وقامچی ______________________

______________________

**هەلبژارتن ژگەلەکان: د ناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤیسە.**

______ **.1** پەردا خانەیی
- **أ.** ڕێ ددەتە هەمی ماددان دناڤڕا دەربازببن بۆ ناڤ خانێ وبۆ ژدەرڤەی خانێ.
- **ب.** ڕێ نادەتە هەمی ماددان دناڤڕا دەربازببن بۆ ناڤ خانێ وبۆ ژدەرڤەی خانێ.
- **ج.** ب شێوەکێ سەرەکی ژچینەکێ جووت ژپرۆتینان پێکهاتیە.
- **د.** ب شێوەکێ سەرەکی ژچینەکێ جووت ژچەوریان پێکهاتیە.

______ **.2** ئەو ماددێن ژلاییێ خانێڤە دهێنە بەرهەمئینان وئەوێن دهێنە دەرکرن بۆ ژدەرڤەی خانێ دڤێت دناڤ کیژ ڤاقانەدا بچن.
- **أ.** ناڤە پلازمە تۆڕ ودەزگەهێ گۆلجی.
- **ب.** مایتۆکۆندریا ودەزگەهێ گۆلجی.
- **ج.** ناڤك و لایسۆسۆم.
- **د.** ڤاکیۆل ولایسۆسۆم.

______ **.3** هەر خانەکا پێتڤی ب برەکا زۆر ژوزێ هەبیت ب شێوەکێ گشتی دڤێت.
- **أ.** ناڤك تێدا هەبیت.
- **ب.** قامچی هەبیت.
- **ج.** مایتۆکۆندریا تێدا هەبیت.
- **د.** دەزووێن هوور هەبن.

______ **.4** هەلوەشاندن وشیکارکرنا ئەندامۆچکێن پیر ئەو ڤایرۆس وبەکتریا ئەوێن خانە دادعیریت ودهێتە ئەنجامدان ژلاییێ:
- **أ.** ڕاییۆسۆمان
- **ب.** لایسۆسۆمان.
- **ج.** ناڤە پلازمە تۆڕا زڤر.
- **د.** ناڤە پلازمە تۆڕا حلی.

______ **.5** ئەو ئەندامۆچکێن ب دوو پەردا دهێنە داپۆشین و DNA تێدا هەبیت ئەڤەنە:
- **أ.** ناڤك، ناڤە پلازمە تۆڕ، لایسۆسۆم.
- **ب.** ناڤك ناڤە پلازمە تۆڕ، کەسکە پلاستید.
- **ج.** ناڤك، کەسکە پلاستید، ومایتۆکۆندریا.
- **د.** ناڤە پلازمە تۆڕ، مایتۆکۆندریا، دەزگەهێ گۆلجی.

ناڤ ________________ پۆل ________ بەروار ________

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**1.** ئەو رۆولێن پرۆتینێن پەردەیێ پێ رادبن چنە کو وەدکەن پەردا خانەیێ ببیتە هەلبژێرەیا پیاروو؟ ________________

**2.** رایبۆسۆم ژ چ پێکدهێن؟ ________________

ئەو فرمانێ خانەیێ چیە یێ رایبۆسۆم بەشداریێ تێدا دکەت؟ ________________

**3.** پەیکەرێ خانەیێ چیە؟ دوو پێکهێنەرێن سەرەکیێن وێ بێژە. ________________

**4.** وەسفا وێ رێکخستنا پێکهاتنێ بکە یا کولك وقامچیێ پێکڤە تێدا دپشکدارن. ________________

**5.** دیوارێن خانێن رووەکی ژ چ پێکدهێن؟ وفرمانێ وان چیە؟ ________________

**6.** **هزرەکا رەخنەگر**: دەمێ چەوری دکەنە دناڤ گیراویێ هێرایێ شووشتنێ (تایێت) دئاڤێدا، هێرایێ شووشتنێ رادبیت ب هەلۆەشاندن وتێکشکاندنا پارچێن مەزنێن چەوری بۆ دندکێن گەلەك بچووکتر. ب هزرا تە، کاریگەریا هێرایێ شووشتنێ لسەر سلامەتیا خانان دێ چ بیت؟ بەرسڤا خۆ رووبکە.

**پێکهاتن وفرمان**: ناڤێ هەر بەشەکی ژوێنەی دڤالاهیێیا هێماکریدا ئەوا پێڤە گرێدای بنڤیسە.
ئەڤ وێنە نواندنە بۆ خانەکا رووەکییا نموونەیی.

أ ________________
ب ________________
ج ________________
د ________________
ه ________________
و ________________
ز ________________
ح ________________
ط ________________

ناڤ ______________ پۆل ______________ بەروار ______________

**پێدێچوونا پشکا 3-3**

# ڕێککستن دزیندەوەرێن فرە خانە دا

**پێدێچوونا زاراڤان:** ڤان زاراڤێن خوارێ پێناسە بکە ونموونەکێ بۆ هەر ئێك ژوان بینە.

**1.** شانا گیانەوەری ______________________________

______________________________

**2.** ئەندامەکێ گیانەوەری ______________________________

______________________________

**3.** کۆئەندامەکێ گیانەوەری ______________________________

______________________________

**4.** زیندەوەرێن مۆلگەهی ______________________________

**هەلبژارتن ژگەلەکان:** دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤیسە.

______ **1.** ئەو خانێن ڕووکارێ ڕووێ لەشێن گیانەوەران پێکدئینن بریتیە ژ:

**أ.** بەستەرە شانە.

**ب.** ڕووکەشە شانە.

**ج.** ماسولکە شانە.

**د.** دەمارە شانە.

______ **2.** کۆما خانێن ڕووەکیێن ئاڤێ دناڤ ڕووەکیدا ڤەدگوهێزیت بریتیە ژ:

**أ.** شانا پیستی.

**ب.** شانا ئەردی.

**ج.** شانا لولەیی.

**د.** شانا ئەندامانی.

______ **3.** ئەو زیندەوەرێن دکۆماندا دژین، خانێن وان دوەکهەڤن و ب کارێن دیارکری ڕادبن، زیندەوەرێن:

**أ.** سادەیێن ناڤك سەرەتایینە

**ب.** سادەیێن ناڤك ڕاستەقینە.

**ج.** ناڤك ڕاستەقینەیێن مۆلگەهینە.

**د.** ناڤك سەرەتایێن فرەخانەنە.

______ **4.** ئەو کریارا وەدکەت کو خانە ب فرمانەکێ دیارکری ڕاببیت دبێژنێ:

**أ.** زۆربوونا خانەیی.

**ب.** هەڤرکیا خانەیی.

**ج.** جیاوازبوونا خانەیی.

**د.** ڤەگوهاستنا خانەیی.

______ **5.** خانێن کەڤزا کەسك، ڤۆلڤۆکس.

**أ.** ژلاییێ فرمانیڤە نە دتاییەتمەندن.

**ب.** ژلاییێ بۆماوەییڤە دوەکهەڤن.

**ج.** لسەر شێوێ شانە وئەندامانادا درێزکرینە.

**د.** لسەر شێوێ شانان درێزکرینە نە لسەر شێوێ ئەندامانا.

ناڤ ______ پۆل ______ بەروار ______

______ **6.** زیندەوەرێن مۆلگەهی دهێنە هژمارتن ژ:

أ. زیندەوەرێن گیانەوەری.
ب. زیندەوەرێن ڕووەکی.
ج. زیندەوەرێن کەڤزی.
د. زیندەوەرێن بەکتریایی.

**بەرسڤا کورت: بەرسڤا پرسیارێن خواریٚ بدە.**

**1.** کیژ شانا گیانەوەری ڕادبیت ب پاڵپشتکرن وپێکڤە گرێدانا شانێن دی؟ ______

**2.** کیژ شانا گیانەوەری ڕادبیت ب ڤەگوهاستنا بلەز بۆ دەمارا ڕاگەهاندنان دناڤ لەشیدا؟ ______

______

**3.** زیندەوەرێن مۆلگەهی وەکی ڤۆلڤۆکس چ جه دناڤ زیندەوەراندا داگیر دکەت؟ ______

______

**4.** **هزرەکا ڕەخنەگر** ئەشنە وەك ئێکگرتنەکا بهێزە دناڤبەرا ملیۆنان ژخانێن کەڕووان وخانێن کەڤزیٚ یێن تایبەتمەند ب ڕابوونا فرمانێن جودا جودا. ئەریٚ ئەشنە دهێتە هژمارتن ب زیندەوەرەکیٚ مۆلگەهی؟ ئەگەری ڕوونبکە. ______

______

______

______

**پێکهاتن وفرمان: پشت ب وێنەی ببەستە بۆ بەرسڤدانا پرسیارێن ل خواریٚ.**




**1.** گەدە نموونەکە لسەر ئاستەکیٚ ڕێکخستنیٚ دبێژنیٚ ______

**2.** سورنجك وگەدە وڕیڤیك، پێکڤە بەشەکی ژئاستەکیٚ ڕێکخستنیٚ پێکدئینن دبێژنیٚ ______

______

**3.** پێکهاتێن دوێنیٚ لایێ ڕاستێدا دیار ئاستەکیٚ ڕێکخستنیٚ دیار دکەت دبێژنیٚ ______

ناڤ ________________ پۆل ________________ بەروار ________________

**پێداچوونا پشکا 1-4**

# کرۆمۆسۆم

**پێداچوونا زاراڤان**: جوداهیێ دناڤبەرا زاراڤ وتێگەهێن دڤان جووتاناندا دیار بکە.

**1.** هستۆن، نەهستونی ________________

________________

**2.** کرۆماتید، ناڤەندە پارچە ________________

________________

**3.** توخمە کرۆمۆسۆم، لەشە کرۆمۆسۆم ________________

________________

**4.** خانا جووت کۆما کرۆمۆسۆمی، خانا تاك کۆما کرۆمۆسۆمی ________________

________________

**هەلبژارتن ژگەلەکان**: دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤیسە.

______ **1.** ددابەشبوونا خانەییدا، ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجینیێ خانەکا زیندەوەرەکێ ناڤك ڕاستەقینە ب توندی یێ ڕێکخستیە ویێ لێکئالیایە وهندەك پێکهاتووان پێکدئینیت دبێژنێ:

**أ.** ناڤەندە پارچە.
**ب.** هستۆن.
**ج.** کۆمەکا کرۆمۆسۆمان.
**د.** کرۆمۆسۆم.

______ **2.** دناڤبەرا دابەشبوونێن خانەییدا ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجینی، دخانا زیندەوەرەکێ ناڤك ڕاستەقینەدا، نەیێ لێکئالیایە ویێ بەلاڤەیە. وڤی شێوەی دبێژنێ:

**أ.** کرۆماتید
**ب.** کرۆماتین.
**ج.** کرۆمۆسۆم.
**د.** هستۆن.

______ **3.** کرۆمۆسۆم دبتریا زیندەوەرێن ناڤك سەرەتاییدا پێکدهێن ژپرۆتینان و ژ:

**أ.** گەردەکا ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجینی یێ تاك وبازنەیی.
**ب.** گەردەکا ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجینی یێ تاك وڕاست.
**ج.** جووتەکێ گەردێن ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجین ویێ پێڤە گرێدای ل ناڤەڕاستا وی.
**د.** جووتەکێ گەردێن ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجین یێن وەکهەڤ وشێوە بازنەیی.

______ **4.** دهەر خانەکا لەشێ مرۆڤیدا 46 کرۆمۆسۆمێن هەین ژبلی سپێرمان وهێکان. ژمارا لەشە کرۆمۆسۆمان دهەر خانەکێدا چەندە؟

**أ.** 2 **ب.** 23 **ج.** 44 **د.** 46

ناڤ ______________________ پۆل ______________ بەروار ______________

______ **.5** ئەگەر ژمارا کرۆمۆسۆمان دخانەکا جووت کۆما کرۆمۆسۆمیدا 16 کرۆمۆسۆم بن، ژمارا کرۆمۆسۆمان دسپێرم وهێکێن وێدا چەندبن؟

**أ.** 8 **ب.** 16 **ج.** 32 **د.** 64

**بەرسڤا کورت**: **بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.**

**.1** ئەو چ پرۆتینن یێن دبنە ئەگەرێ هندێ کو برا مەزنا ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجین، دخانەکا ناڤك ڕاستەقینەدا، هەبوونا وی دناڤ ناڤکێدابیت؟ ورووڵێ وان دڤێ چەندێدا چیە؟ ______________________

______________________

**.2** لایەنێن وەکهەڤیێ دناڤبەرا کرۆمۆسۆمێن وەکهەڤدا چنە؟ ______________________

______________________

**.3** چ دبێژنە ڤی وێنەی، وچەوا دهێتە بکارئینان بۆ دەستنیشانکرنا توخمێ مرۆڤەکی؟

1 2 3 4 5
6 7 8 9 10 11 12
13 14 15 16 17 18
19 20 21 22 x y

______________________

______________________

______________________

______________________

______________________

**.4** **هزرەکا ڕەخنەگر** هندەك زیندەوەرێن تا ڕادەکی سادە وناڤك ڕاستەقینە، وەکی ڕووەکا کژنیژێ، دبیت وێ ژمارەکا کرۆمۆسۆمان هەبیت گەلەك پتر وئالۆزتربن ژژمارا کرۆمۆسۆمان دزیندەوەرەکێ ناڤك ڕاستەقینەدا، وەکی گیانەوەرەکێ شیردار. ئەڤ ڕاستیە چ دگەهینیت ژلایێ قەبارە ورێکخستنا کرۆمۆسۆمان دجۆرێن جوداجودا دا ژزیندەوەران.

______________________

______________________

______________________

**پێکهاتن وفرمان**: **ئەڤ وێنێ ل خوارێ پێکهاتێن جوداکری ودەرئینانینە ژناڤکا خانەکا ناڤك ڕاستەقینە کو یا دقۆناغا دابەشبوونێدا. ناڤێ هەر پێکهاتەکی یان هەر جووتەکی ژپێکهاتان دڤالاهییا گونجایدا بدانە.**

أ ______________________

ب ______________________

ج ______________________

د ______________________

ناڤ ______________________ پۆل ______________ بەروار ______________

**پێداچوونا پشکا 2-4**

# دابەشبوونا خانەیی

**پێداچوونا زاراڤان**: بازنەکێ لدۆر وی زاراڤی بکێشە ئەوێ سەرب وێ کۆمەڵێڤە نەبیت، و ب کورتی ئەگەرێ وێ دیار بکە.

**1.** قۆناغا گەشا ئێکێ، قۆناغا گەشا دووێ، قۆناغا متبوونێ، قۆناغا دوماهییێ ______________

______________

**2.** قۆناغا ژێکجوودابوونێ، ناڤبەرە قۆناغ، قۆناغا کەمەرەیی، قۆناغا ئامادەیی ______________

______________

**3.** دووکەربوون، دابەشبوونا یەکسان، کەمە دابەشبوون، دابەشبوونا سایتۆپلازمی ______________

______________

**4.** کەندەکا شەقبوونێ، دابەشبوونا سایتۆپلازمی، ڕیشاڵێن تەشییێ، خانەپەڕە ______________

______________

**5.** ناڤەندۆکە، چیکلدانە، ڕیشاڵێن تەشییێ، بۆریچکێن هوور ______________

______________

**هەلبژارتن ژگەلەکان**: دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤێسە.

______ **1.** خانێن ناڤك بەراهی زۆربن ب ڕێکا کریارەکێ دبێژنێ:

**أ.** دابەشبوونا یەکسان. **ج.** دووکەربوون.

**ب.** کەمە دابەشبوون. **د.** ئێکگرتنا دووەمی.

______ **2.** دخانێن ناڤك ڕاستەقینەدا، ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجین دهێتە کۆپیکرن دقۆناغەکێدا ژزڤڕۆکا خانێ دبێژنێ:

**أ.** قۆناغا دابەشبوونێ. **ج.** قۆناغا گەشا ئێکێ.

**ب.** قۆناغا دروستکرنێ (ئاڤاکرنێ) **د.** قۆناغا گەشا دووێ.

______ **3.** سایتۆپلازمێ خانا ناڤك ڕاستەقینە ب کریارەکێ دابەش دبیت دبێژنێ:

**أ.** دابەشبوونا یەکسان. **ج.** کۆپیکرن.

**ب.** کەمە دابەشبوون. **د.** دابەشبوونا سایتۆپلازمی.

______ **4.** ئەو دەزیێن (ڕیشاڵێن) دناڤبەرا هەردوو ناڤەندە تەناندا دهێنە کێشان دەمێ دابەشبوونا یەکساندا دبێژنێ:

**أ.** ڕیشاڵێن جەمسەری. **ج.** ئەکتین.

**ب.** ڕیشاڵێن تەشییێ. **د.** ڕیشاڵێن هوور.

ناڤ ____________ پۆل ____________ بەروار ____________

____ **.5** دقۆناغا متبوونێدا خانە پارڤ دبن :

**أ.** بەرهەمئینانا ناڤکەترشێ کێم ئۆکسجین.

**ب.** خۆ ئامادەکرن بۆ دابەشبوونا خانەیی.

**ج.** دەرکەفتنێ ژزڤڕۆکا خانەیی.

**د.** جولاندنا کرۆمۆسۆمێن خۆ وڤەگۆهاستنا وان بۆ هێلا کەمەرەییا خانێ:

**بەرسڤا کورت**: بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.

**.1** هەر پێنج قۆناغێن سەرەکیێن زڤڕۆکا خانێ بێژە، و ب کورتی ڕوونبکە کا دهەر قۆناغەکێدا چ ڕوودەدەت ____________

____________

____________

____________

**.2** هەر چوار قۆناغێن دابەشبوونا یەکسان بێژە، و ب کورتی ڕوونبکە کا دهەر قۆناغەکێدا چ ڕوودەدەت ____________

____________

____________

____________

**.3** وەسفا دابەشبوونا سایتۆپلازمی بکە دخانا ڕووەکیدا ____________

____________

____________

____________

**.4** **هزرەکا ڕەخنەگر** ئەرێ چ ڕوودەدەت دخانەکێدا وئەو خانێن ژوێ بەرهەمدهێن ئەگەر ئەڤ خانە دقۆناغا گەشا ئێکێدا نە بوورن ددەمێ زڤڕۆکا خانەییدا؟ ئەڤێ چەندێ ڕوونبکە. ____________

____________

____________

**پێکهاتن وفرمان**: لبن هەر وێنەکی ناڤێ وێ قۆناغا دابەشبوونا یەکسان بنڤێسە ئەوا وێنێ ل خوارێ نواندنا وی دکەت.

أ ____________ ب ____________ ج ____________ د ____________

ناڤ ______________________ پۆل ______________ بەروار ______________

**پێداچوونا پشکا 3-4**

# کەمە دابەشبوون

**پێداچوونا زاراڤان:** ڤان زارڤێن خوارێ پێناسە بکە.

1. گەمێت ______________________________

2. چوارینە ______________________________

3. دابەشبوونا سەربەست ______________________________

4. جەمسەرە تەن ______________________________

**هەلبژارتن ژگەلەکان:** دناڤ بۆشاییێدا پیتا بەرسڤا دروست بنڤێسە.

______ 1. ددەمێ پیتگورکێیدا
- أ. ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجین دهەر کرۆمۆسۆمەکێدا دهێتە کۆپیکرن.
- ب. ریشاڵێن تەشییێ بەرزە دبن.
- ج. سایتۆپلازم دابەشدبیت.
- د. کرۆمۆسۆم ل تەنشت کرۆمۆسۆمێن وەکهەڤێن خۆ ڕێزدبن.

______ 2. ددەمێ کریارا پەڕینەوەدا بەشێن کرۆماتیدان ڕادبن ب:
- أ. دوو هێندکرنا بڕا ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجین دهەر کرۆمۆسۆمەکێدا.
- ب. ڤەگوهاستنێ ژکرۆمۆسۆمێن لەشی بۆ کرۆمۆسۆمێن توخمی.
- ج. شکەستن وپێڤەنسیانێ ب کرۆماتیدێن تەنشت وێ، دکرۆمۆسۆمێن وەکهەڤدا.
- د. ژێکجودابوونێ ژئێکدوو وڤەگوهاستنێ بەرەڤ جەمسەرێن بەرامبەر ئێك دخانێدا.

______ 3. دکیژ قۆناغا کەمە دابەشبوونێدا چوارینە پێکدهێن؟
- أ. قۆناغا ئامادەییا ئێکێ.
- ب. قۆناغا دوماهییێ یا ئێکێ
- ج. قۆناغا کەمەرەییا دووێ.
- د. قۆناغا ژێکجودابوونا دووێ.

______ 4. دابەشبوونا دووێ ژکەمە دابەشبوونێ.
- أ. پشتی کریارا کۆپیکرنا ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجین دهێت.
- ب. کرۆماتیدان ژێکجودا دکەت ولسەر هەردوو جەمسەرێن بەرامبەرێن خانێ دابەش دکەت.
- ج. کرۆمۆسۆمێن وەکهەڤ ژێکجودا دکەت ولسەر هەردوو جەمسەرێن بەرامبەرێن خانێ دابەش دکەت.
- د. خانێن نوویێن جووت کۆمێن کرۆمۆسۆمی بەرهەمدئینیت.

ناڤ ________________ پۆل ________________ بەروار ________________

5. ______ دکرياراو بەرهەمهاتنا هێکێدا، خانەکا زوبوونێ يا جوت کۆما کروموسۆمی دێ ب رێکا کەمە دابەشبوونێ دابەشبیت بۆ بەرهەمئینانا:

أ. ئێک گەمێتێ جووت کۆما کرۆمۆسۆمی.
ب. چوار گەمێتێن جوت کۆما کرۆمۆسۆمی.
ج. ئێک گەمێتێ تاک کۆما کرۆمۆسۆمی.
د. چوار گەمێتێن تاک کۆما کرۆمۆسۆمی.

**بەرسڤ کورت**: **بەرسڤا پرسیارێن خوارێ بدە.**

1. وەسفا دوو رێکان بکە کو تێدا تێکەلبوونا بۆماوەیی رویدەدەت دەمێ کەمە دابەشبوونێدا ________________

________________

________________

2. هەر چوار قۆناغێن دابەشبوونا ئێکێ ژ کەمە دابەشبوونێ بێژە، و ب کورتی روونبکە کا دهەر قۆناغەکێدا چ رویدەدەت ________________

________________

________________

3. چەوا خانێن بەرهەمهاتی ژدابەشبوونا ئێکێ ژوان خانان دجودانە ژێن ژدابەشبوونا دووێ بەرهەمهاتین دکەمە دابەشبوونێدا ______

________________

4. **هزرەکا رەخنەگر** لایەنەکێ ئەرێنی ولایەنەکێ نەرێنی بۆ نا توخمە زورنێ بێژە ب بەراورد دگەل توخمە زوبوونێ ________________

________________

________________

________________

**پێکهاتن وفرمان**: لبن هەر وێنەکی ناڤێ وێ قۆناغا کەمە دابەشبوونێ بنڤێسە ئەوا وێنێ ل خوارێ نواندی و دکەت.

أ ________________ ب ________________ ج ________________ د ________________

# ڕێککخستنا داتاییێن تاقیگەهی

داتاییێن تە هەمی ئەو پێزانینن ئەوێن تو ب تۆمارکرنا وان ڕابووی ددەمێ چالاکیەکا دیارکریدا. جوّرێن وان داتایان یێن هاتینە کۆمکرن دهێنە گرێدان ب جوّرێ وێ چالاکیێڤە ئەوا هاتیە ئەنجامدان. دبیت داتا کۆمەکێ ژکێشە یان ژقەباران یان کۆمەکا گوهۆڕینان درەنگاندا یان لیستەکا ناڤێن زانستی بخوّڤە بگریت. نەیا گرنگە کا تە چ جوّرێ داتایان کۆمکریە، لێ دڤێت هەمی داتا ب چاڤدێری بهێنە چارەسەرکرن بۆ دابینکرنا ئەنجامێن ڕاست وهوور. دبیت هندەك جاران وەسا دیاربیت کو ئەو داتا نە دراست ودروستن، لێ هەتا دڤی باریدا ژی، گرنگیەك یا هەی ودڤێت ب شێوەکێ هوور بهێنە تۆمارکرن. دبیت ئەو داتاییێن وەسا دیاردبن کو نە دڕاستن، نە دچاڤەرێکریین یان ژئەنجامێ شاشیەکا تاقیکاریێ بن.

گەلەك ڕێك یێن هەین بۆ نڤێسین ورێکخستنا داتایان، وژوان خشتێن داتایان، وهێلکاری، و وێنێن داتایان، و وێنێن هێلکاری. مامۆستاییێ تە دێ هاریکاریا تە کەت لسەر ورەگرتنا بڕیارێ لسەر باشترین شێوێ دگونجیت دگەل جوّرێ داتاییێن تو کۆمدکەی.

یا گرنگ ئەوە داتاییێن تە لدەمێ نڤێسینا وان یەکێن پیڤانێ یێن گونجای بخوّڤە بگریت. بلا ل بیرا تە بیت کو داتا پیڤەرن یان تێبینینە، ونە بتنێ چەند ژمارەکن. دڤێت داتا وخشتە و وێنێن هێلکاری و وێنێن داتایان ناڤ ونیشانێن وەسفکری وتەمام هەبن دا کو کەسێن دی ژی تێبگەهیت بێی ئەو دبەرهەڤبن لدەمێ ڕابوونێ ب چالاکیێ.

گەلەك ڤەدیتنێن زانستی ڕوودانە ب ڕێکا ڕێکەفتێ، ددەمێ ئەنجامدانا چالاکیەکا تاقیگەهیدا کو پتریا جاران ب وان ڤەدیتنانڤە نە دگرێدایبوون. وپشتی ماوەکێ درێژ ژئەنجامدانا کاری، ئەو زانایێن تۆمارێن تەمام ب چاڤدێری هەلگرتین تێبینیا ئاراستە وپەیوەندیێن نە پێشبینکری کریە دناڤبەرا داتایاندا. تێنوسێن تێبینیێن تاقیگەهێن زانایێن زیرەك دتژینە ژوێنێن داتایان ولێدوانان، ودهەر کریارەکا بجهئینانیدا هەمی پێنگاڤ و ب هووری تێدا هاتینە نڤێسین.

### خشتێن داتایان وهێلکاری

خشتێن داتایان، دراستیدا ژهەمی ڕێکێن نڤێسینا داتایان بەربەلاڤترن. دسەر هندێرا کو خشتێن داتاییێن ئامادە یێن لبەر دەست هەین ب تایبەتی دپەرتووکێن کارێن تاقیگەهیدا، لێ گرنگترە تو ب خوّ بشێی خشتان بۆ خوّ بدانی. باشترین ڕێك بۆ بجهئینانا ڤێ چەندێ هەلبژارتنا ناڤ ونیشانەکێیە بۆ خشتێ داتاییێن تە، پاشی دانانا لیستەکێ ب جوّرێن داتاییێن پێتڤی ب کۆمکرنێ هەین. وئەڤ لیستە دێ بیتە ناڤ ونیشان بۆ ستوونێن داتاییێن تە. وبۆ نموونە، ئەگەر تە داتا لدۆر گەشەکرنا ڕووەکەکێ کۆمکرن، کو درێژیا ماوێ پێتڤی بۆ گەشەکرنا ڕووەکی، وبڕا گەشەکرنێ بخوّڤە بگریت، تو دێ شێی داتاییێن خوّ دخشتەکێ وەکی ڤێدا نڤێسی.

**داتاییێن گەشەکرنا ڕووەکان**

| | |
|---|---|
| | |
| | |
| | |
| | |

ئەڤ داتایە بناغەنە بۆ شلۆڤەکرن ولێکدانێن تە یێن بهێن. تو دشێی بەردەوام پرسیارێن نوو بکەی لدۆر داتایان، لێ تو نەشێی داتایێن نوو بدەستخوڤە بینی بێی دووبارەکرنا تاقیکرنێ.

**وێنێن داتایی**

پشتی کۆمکرنا داتایان، پێتڤییە تو ڕێکەکێ بۆ پێشکێشکرنا وان دەستنیشان بکەی. ئێك ژوان ڕێکان بۆ پێشکێشکرنا ئەنجامێن خۆ، بکارئینانا وێنێ داتاییە. دوو جۆر ژوێنێن داتایی هەنە کو گەلەك دهێنە بکارئینان: وێنێ داتایێ هێلی و وێنێ داتایی ب ڕێکا ستوونان. دەربارەی وێنێ داتایێ هێلی، داتا دهێنە ڕێکخستن ب شێوەکی کو دوو گۆڕاو بتنێ دخالەکێدا بهێنە نواندن. تو دشێی و ب سانەهی، وێنێ داتایێ هێلی بۆ وان داتایان بدانی یێن دخشتێ گەشەکرنێدا هاتین. پێنگاڤا ئێکێ وێنەکرن وبناڤکرنا تەوەرانە. وبەری تو دەستپێبکەی دڤێت تو بڕیارێ بدەی لسەر وێ ستوونا داتایان ئەوا ب تەوەرێ سینی دێ هێتە نواندن (تەوەرێ ئاسویی) و وێ ستوونا داتایان ئەوا ب تەوەرێ صادی دێ هێتە نواندن (تەوەرێ ستوونی).

تاقیکرنان دوو جۆر ژگۆڕاوان هەنە، یان هۆکارێن بهێنە گوهۆڕین، گۆڕاوێن سەربەخۆ، ئەو گۆڕاون کو دێ هەبن هەتا ئەگەر هۆکارێن دی نەبن، دەربارەی وێ نموونا دلاپەرێ چوویدا هاتی، دەم گۆڕاوەکێ سەربەخۆیە، چونکی دەم هەر یێ هەی چ ڕووەك هەبن یان نەبن، گۆڕاوێ سەربەخۆ لسەر تەوەرێ سینی یێ وێنێ داتایی دهێتە دانان، گۆڕاوێ پاشکۆ، دڤێ نموونێ دا دێ درێژیا ڕووەکێ بیت. گۆڕاوێن پاشکۆ لسەر تەوەرێ صادی یێ وێنێ داتایی دهێتە دانان.

پشتی هینگێ، دڤێت تو پەیسکا پیڤانێ بۆ تەوەران دوێنێ داتاییێ خۆدا بهەلبژێری. دڤێت تو وێنەکێ داتایی ئەنجامبدەی کو مەزنترین ڕووبەر ژلاپەری دابۆشیت. ژبەر کو وێنێن داتایێن قەبارە مەزن دانانا وان وخواندنا وان ب سانەهیترە ژیێن قەبارێ وان بچووك. لسەر تە پێتڤییە تو بۆ هەر تەوەرەکی پەیسکەکا پیڤانێ بهەلبژێری کو مەزنترین بڕ ژلاپەرێ وێنێن داتایی بخۆڤە بگریت. بلا لبیرا تەبیت، کو پشتی تو چارچۆڤی پەیسکا پیڤانێ دهەلبژێری (بۆ نموونە، ژمارا ڕۆژان کو هەر کۆمەك لسەر تەوەرێ سینی نواندنا وان دکەن)، تو نەشێی پشتی هینگێ ب گوهۆڕی. تو نەشێی بێژی کو پیڤانا دەمی ژمارە 1 نواندنا ڕۆژەکێ دکەت وپیڤانا دەمی ژمارە 2 نواندنا 10 ڕۆژان دکەت. ئەگەر تە پەیسکا پیڤانێ گوهۆڕی، وێنێ داتاییێ تە نواندنەکا هوور بۆ داتایێن تە ناکەت.




پێنگاڤا ددوڤڕا دانانا خالانە بۆ هەر جووتەکی ژژماران. پشتی دانانا هەمی خالان، هەمیا پێکڤە گرێدە ب باشترین هێلا ڕاست یان ب چەماوەکی. بلا لبیرا تە بیت کو دەمێ تو وێنەکێ داتایی ئەنجامددەی نە بتنێ، تو یێ خالان دگەهینیە ئێك. لێ تو یێ ڕادبی ب وێنەکرنا چەماوەکێ باشتر گونجای، تو یێ هێلەکێ یان چەماوەکی وێنە دکەی کو بەرەبەرە کۆما خالێن داتایێن تە ببریت.

ئەگەر تە بڤێت تو وێنێ داتاییێ ب ستوونان بکاربینی، پێنگاڤا ئێکێ وەکی وێیە یا دوێنێ داتاییێ هێلیدا ودڤێت تو تەوەرێن تایبەت ب تەڤە هەلبژێری وبناڤبکەی. گۆڕاوێ سەربەخۆ لسەر تەوەرێ سینی دهێتە دانان وگۆڕاوێ پاشکۆ لسەر تەوەرێ صادی. لێ ل جهێ دانانا خالان لسەر وێنێ داتایی، دڤێت تو نواندنا گۆڕاوێ پاشکۆ ب ستوونەکێ بکەی کو ژتەوەرێ سینی دەستپێدکەت تا جهێ دانانا خالێ.

بۆ نموونە، ئەگەر تە داتایێن سامپلی بۆ گەشەکرنا ڕووەکێ بکارئینان، دێ درێژیا ڕووەکێ 10 cm بیت دڕۆژا ئێکێدا. دەمێ تو وێنێ داتایی ددانی، تو دێ ڕابی ب وێنەکرنا ستوونەکێ کو دهێتە کێشان تا نیشانا درێژیێ 10 cm لسەر تەوەرێ صادی.

گەشەکرنا ڕووەکێ

درێژیا ڕووەکێ (ب سم)

دەم ب ڕۆژان

## وێنێن هێلکاری

دهندەك باراندا، ئەو داتایێن کو تە دڤێت نواندنا وان بکەی نە ژمارەنە. ئەڤژی هندێ دگەهینیت کو تو نەشێی بدانیە دخشتەکێ داتایاندا یان لسەر وێنێ داتایی. باشترین ڕێك بۆ نواندنا ڤان جوٚرە پێزانینان ئەوە کو تو وێنەکی بۆ بکێشی وناڤێن بەشێن وی لسەر بنڤێسی. بۆ ئەنجامدانا وێ، وی وێنەی بکێشە یێ چاڤێن تە دبینیت، پاشی ڕابە بدانا ئاڤان بۆ زۆرترین بەش وپێکهاتێن وی. ئەڤ تەکنیکاریە ب شێوەکێ تایبەت دتاقیگەها زیندەزانییێدا دهێتە بکارئینان، ژبەرکو گەلەك ژجالاکیان تێبینیکرنا نموونێن زیندی یان نموونێن هەلگرتی بخوٚڤە دگریت. پێتڤی نا کەت تو ببیە شێوەکارەکێ باش بۆ ئەنجامدانا وێنەکێ هێلکاریێ باش بۆ کارەکێ تاقیگەهی.




ڕووەکەکا فاسۆلیایێ یا بچووك

چەند تشتەك یێن هەین دڤێت لبیرا تەبن دەمێ تو وێنەکێ هێلکاری ئەنجامددەی بۆ کارێ خوٚیێ تاقیگەهی. ئێکەم، وێنەکێ هێلکاریێ مەزن ئەنجامبدە کو قەبارێ وی ڤەکوٚلینا وی ب سانەهی بکەت، وبلا هەمی پێکهاتێن دهێنە دیتن بخوٚڤە بگریت. دووەم، دڤێت وێنێن هێلکاری ماوێن ڤەبڕ دناڤبەرا بەشێن مودێلیدا دیار بکەت ب شێوەکی کو بگونجیت دگەل ڕوخسارێ وی. پەیوەندیێن گرێدایی ب قەبارە وپیڤانێڤە دگرنگن بۆ تێگەهشتن وشلوٚڤەکرنا تێبینیان. سێ، وبۆ مفا وەرگرتن ژوێنێ هێلکاریێ تە ب باشی، دڤێت تو ناڤێن بەشێن وێ بدانیە سەر ودڤێت هەمی ناڤ ب شێوەکێ ئاشکرا بهێنە نڤێسین. وئەو هێلێن دهێنە کێشان ژناڤان تا دگەهنە بەشێن وێ دڤێت دڕاستبن. وژبەر هندێ دڤێت تو ڕاستەی بکاربینی. دڤێت هێلێن ناڤان ب چ شێوە ئێکودوو نەبڕن. ل دوماهیێ، ناڤونیشانەکی بدە وێنێ هێلکاری. دڤێت ئەو کەسێ سەحکەتە وێنێ تەیێ هێلکاری شیانا نیاسینا مودێلان هەبیت. بلا لبیرا تەبیت کو ڕوون وئاشکرایی وهووری گرنگترین بەشێن وێنێ هێلکاریێ تاقیگەهینە.

# سلامەتی دتاقیگەها زیندەزانیێدا

تاقیگەها تە یا زیندەزانیێ جهەکێ کێم وێنەیە، تو دشێی تێدا فێری گەلەك تشتان ببی ئەوژی ب رێکا بجهئینانا هندەك کاران کو تو نەشێی ل چ جهێن دی پێ رابی. هەروەسا ئەو هندەك مەترسیان ژی بخوڤە دگریت کو شیانا کۆنترۆلکرنا وان هەیە ئەگەر ڤان رێنماییێن ئێمناهیێ وهەمی رێنماییێن ژلایێ مامۆستایێ تە دەردکەڤن بهێنە بجهئینان.

پاراستنا تە وقوتابیێن دی بەرپرسیاریا تەیە ئەوژی ب رێکا رەفتارەکا هێمن دتاقیگەهێدا. هێماییێن چاپکری یێن تایبەت ب سلامەتیێ وهێمنیێڤە بنیاسە — ئەوژی ئاماژێ ب رێنماییێن زێدەبار دکەن کو دڤێت تو بجهبینی.

### ئەگەر تو دتاقیگەهێڤە بی، ودهەمی دەماندا.

- **کاربکە دا هیببە بنەماییێن رابوونێ ب چالاکیێن تاقیگەهێ ــ و ب تایبەتی بابەتێن پەیوەندی ب سلامەتیێڤە هەین ــ بەری بچیبە دتاقیگەهێڤە.** مەترسیێن چاڤەرێکری یێن بەیوەندی ب مادده وکەرستە وکریارێن پێتڤیڤە هەین بەری ب چالاکیێن تاقیگەهێ رابی. بەری تو دەست ب کارێ خۆ بکەی، هەر بەشەکێ تو تێنەگەهی ژمامۆستایێ خۆ بخازە بۆتە روونبکەت.
- **نابیت تو چ تاقیکرنان ئەنجامبدەی ئەگەر مامۆستایێ تە ب شێوەکێ دەستنیشانکری ژتە نەخاستبیت.** دکارێ خۆ دا چ ماددان بکارنەئینە کو رێ نە دابیتە تە بۆ بکارئینانا وان.
- **دتاقیگەهێدا چ جاران بتنێ کارنەکە.**
- **جهێ هەمی ئامێرێن سلامەتیێ وتەنگاڤیێ یێن دتاقیگەهێدا دهێنە بکارئینان بزانە. ئەوژی ڤان تشتان بخۆڤە دگریت،** جهێن شویشتنا چاڤان، بەتەنیێن ئێمناهیێ، ودۆشێن ئێمناهیێ، وبوتلێن ڤەمراندنا ئاگری، کەرەستێن فریا کەوتنا سەرەتایی وئامێرێن تایبەت ب رێژتنا ماددێن کیمیاییڤە.
- **جهێ نێزیکترین تەلەفۆن بزانە وپشتراستبە ژهەبوونا لیستا ژمارێن تەلەفۆنێن تەنگاڤیان.**
- **بەری دەست بکاری بکەی. پرچا درێژ گرێدە، هچکێن درێژ بلندکە، وهەر ئامێرەکێ خۆپاراستنێ یێ کەسایەتی بکاربینە، لدویڤ ئەوا مامۆستایێ تە ژتە دخازیت.** جلکێن شەپوشۆر نەکە بەرخۆ، چونکی دبیت ب هندەك تشتان بکەڤیت وببیتە ئەگەرێ کەتنا وان، یان ژی دبیت ئاگر بەربیتێ یان گیراوێن کیمیایی بمێژن.
- **ئێکسەر مامۆستایێ خۆ ئاگەهداربکە لدەمێ پەیدابوونا هەر رووداوەکێ یان دیاربوونا هەر مەترسیەکێ هەرچەند یا سادە ژی بیت.** هەروەسا دڤێت برینپێچێ قوتابخانێ یان پزیشك بهێتە ئاگەهدارکرن ب هەر رووداوەکا ببیتە ئەگەرێ خوێنبەربوونی یان بێهوشبوونێ یان کەڤتنە بەر ماددێن کیمیایی یان داعیرانا هەر ماددەیەکی.
- **ئەگەر ئاگربەربوونەك رووددا، ئێکسەر مامۆستایێ خۆ ئاگەهداربکە وژتاقیگەهێ دەرکەڤە.**
- **چ خوارن وڤەخوارنا نەخۆ وبەرهەمێن جوانکاریێ بکارنەئینە.** نابیت ب چ شێوە خوارنان دناڤ تاقیگەهێدا بهەلگری. دەستێن خۆ ژسەروچاڤێن خۆ دووربێخە. پشتی هەر چالاکیەکا تاقیگەهێ وبەری ژتاقیگەهێ دەرکەڤی دەستێن خۆ باش بشۆ. باش بزانە کو هندەك بەرهەمێن تایبەت ب پرچێڤە زوی ئاگر بەر دبیتێ، هەتا پشتی بکارئینانا وێ ژی.
- **پاقژی وبێدەنگیێ دجهێ کارێ خۆدا بپارێزە.** پەرتووك وماددێن پێتڤی بۆ ئەنجامدانا تاقیکرنێ دگەل خۆ بینە، وژبلی ڤان چ تشتێن دی نەبە دناڤ تاقیگەهێدا.
- **لدویڤ رێنماییێن مامۆستای،** جهێ کارێ خۆ پاقژ بکە پشتی بدوماهیك هاتنا کارێ تە دتاقیگەهێدا.



## سلامەتیا هەردوو چاڤان

- **بەرچاڤکێن پارێزەرێن تایبەت ب ئێمناهیێ دژی ماددێن کیمیایی بکاربینە.** هەر دەمێ تو لسەر گیراوەکێ کیمیایی یان ماددەکێ کیمیایی کار دکەی، یان تو ب گەرمکرنا ماددەکی ڕادبی، یان هەر ئامێرەکێ میکانیکی بکاردئینی یان تێبینیا کریارەکا فیزیایی دکەی دڤێت تو بەرچاڤکێن پارێزەر بکاربینی.
- **دەمێ ماددەك ب چاڤێن تە دکەڤیت.**
  1) چاڤێن خۆ باش ب ئاڤێ بشۆ بکێماسیڤە بۆ دەمێ 15 خولەکان.
  2) مامۆستایێ خۆ ب وێ چەندێ ئاگەهدار بکە.
- **نابیت دتاقیگەهێدا هاوێنێن لکێنەربدانی بۆ مەرەمێن جوانکاریێ،** چونکی دبیت شلە یان گاز بچنە دبن هاوێنێن لکێنەرڤە وبگەهنە گۆیا چاڤێ وزیانێ بگەهیننێ. ئەگەر بکارئینانا هاوێنێن لکێنەر بۆ تە یا پێتڤی بیت ئەوژی ئەگەر پزیشکی گۆتبیت، دڤێت تو وان جۆرە بەرچاڤکان بکاربینی ئەوێن مەلەڤان دبن ئاڤێڤە بکاردئینن.
- **ب چ ڕێکا و ب شێوەکێ ئێکسەر بەرێ خۆ نەدە ڕوو ناهیا ڕۆژێ، چ ب ڕێکا وان ئامێر ودەزگەهێن ژجۆرێ بینینی بن یان ژجۆرێ هاوێنەیی بن یان هەر ئامێرەکێ کۆمکرنا ڕووناهییا ڕۆژێ بۆ ڕووناهیکرنا مایکرۆسکۆپێ.**



## سلامەتی ژکارەبێ

- **نابیت دەزگەهان بکاربینی ئەگەر تێلێن کارەبێ دڕیسبن.**
- **پشتڕاستبە کو هەمی وایەرێن کارەبێ ب ڕووێ مێزێن کاریڤە دلکاندینە،** ب شێوەکی کو ژجهێ خۆ نەچن دەمێ ئامێرەکی لسەر مێزێ ڕادکێشی.
- **نابیت ب هیچ شێوەکی ئامێرێن کارەبایی ل وان جهان بهێنە بکارئینان یێن ئاڤ لێ هەبیت، یان ئەگەر ئاڤ ب دەستێن تەڤە هەبیت یان ب جلکێت تەڤە.**



## جلکێن پارێزەر

- **چاکیتێ تاقیگەهێ بکە بەرخۆ دەمێ تو دتاقیگەهێدا کار دکەی دا کو چ ماددە یان گیراوێن کیمیایی ب پیستێ تە نەکەڤن وجلکێن تە پیس نەبن. جلکێن فرەه ل کەمەرا خۆ ب شدینە.**



## گرنگیدان ب گیانەوەران

- **دەستێ خۆ نەکەیە چ گیانەوەرێن کیڤی وخۆ نێزیکی وان نەکە.** ددەمێ ئەنجامدانا کارەکێ مەیدانی ژدەرڤەی تاقیگەها قوتابخانێ هشیاری گیانەوەرێن ژەهردار ومەترسیداربە.
- **دەستووریێ ژمامۆستایێ خۆ وەربگرە، بەری تو هەر گیانەوەرەکێ کیڤی یان یێ کەهی بینیە دناڤ ئاڤاهیێ قۆتابخانێدا.**
- **لدویڤ ڕێنماییێن مامۆستایێ خۆ سەرەدەریێ دگەل گیانەوەران بکە، وزیانێ نەگەهینێ.**




## خۆپاراستن ژتەنێن تیژ

- **گەلەك یێ هشیاربە دەمێ تو ئامێرێن تیژ بکاردئینی وەکی کەتەر، دەرزیکێن تیژ، وکێرکان (چەقو).**
- **نابیت ب چ شێوەکی تو شەفرێن ڕیه تراشینێ دتاقیگەهێدا بکاربینی.**
- **نەڕابە ب بڕینا تەنان وئەو ددەستێ تەدا بن، تەنان بدانە سەر ڕووەکێ گونجای پاشی ببڕە.**



## خۆپاراستن ژماددێن کیمیایی

- **دڤێت تو کەلوپەلێن خۆپاراستنێ یێن گونجای بکاربینی وەکی** بەرچاڤکێن پارێزەر، ودەستگۆرکان وچاکیتێ تاقیگەهێ دەمێ تو ب ماددە یان گیراوێن کیمیایی کار دکەی.
- **تام نەکە چ ماددان ودەستێ خۆ نەکەیێ وبێهن نەکەیێ وتێزیکی چاڤێن خۆ نەکەی ئەگەر مامۆستایێ تە ژتە نەخازیت. ئەگەر مامۆستایێ تە ژتەخاست تو بێهنکەیە ماددەکی، ئەوێ چەندێ بجهبینە ب ڕێکا ئاراستەکرنا هەلمێ بەرەڤ خۆ ب ڕێکا هەردوو دەستێن خۆ.** نابیت ب چ شێوە تو مژوکێ بکاربینی بۆ هەلکێشانا هەر ماددەکی ب ڕێکا دەڤی. لێ پەمپەکا مژوك بکاربینە ئەوژی لدویڤ ڕێنماییێن مامۆستای.
- **دڤێت تو ب هشیاری سەرەدەریێ دگەل گیراوێن کیمیایی بکە. سەحکە کارتا ناڤلێنانێ ئەوا لسەر بوتلی هەی وپێگریێ ب بجهئیانێن بکارئینانا هێمن بکە.** نابیت ب هیچ شێوەکی ماددێن کیمیایی یان گیراوێن کیمیایی یێن نەهاتینە بکارئینان بزڤرینیەڤە بۆ ناڤ بوتلێ وان. ئەو بوتل وبوریێن تە بکارنەئینایین بزڤرینەڤە بۆ مامۆستایێ خۆ.
- **نابیت ب چ شێوە تو ڕابی بتێکەلکرنا ماددێن کیمیایی**، ئەگەر مامۆستایێ تە ژتە نەخاست بیت.
- **نابیت ب چ شێوە تو ئاڤێ ب ڕێژیە سەر ترشەکێ بهێز یان تفتەکێ بهێز.** چونکی دبیت تێکەلکرن وزەکا گەرمیێ یا مەزن پەیدا بکەت وبەلاڤەببیت ئەڤ چەندە بلا هەردەم لبیرا تەبیت.
  «وەبکە یا ژتە دهێتە خواستن –
  ترشی (یان ماددێ تفت) بڕێژە سەر ئاڤێ».
- **ئەگەر هەر ماددەیەکێ کیمیایی ڕێشت ئێکسەر مامۆستایێ خۆ بێ ئاگەهدار بکە.** وسەرەدەریێ دگەل ماددێن ڕێشتی بکە بتنێ لدویڤ ڕێنماییێن مامۆستایێ خۆ.
- **پشتڕاستبە ژنەبوونا چ ژێدەران بۆ ئاگری یان بۆ گوڕیێ یان گەرمیێ** (گوڕیەکا ئاشکرا دهەوایدا، یان فەتیلێن گەرمگرنێ، یان فرنا کارەبێ، وهەر تشتەکێ دی) بەری تو شلە یان گازێن دهێنە سۆتن **Inflamable** بکاربینی.

## خۆپاراستن ژڕووەکان

- **نابیت تو چ ژبەشێن ڕووەکێ دتاقیگەهێدا بخوی.** (و ب تایبەتی ئەو تووڤێن ل بازاری دهێنە فرۆتن). چاڤێن خۆ نەپەرخینە وپیستێ خۆ نەخورینە ب گڤاشتییێن ڕووەکان.
- **دەستگۆرکێن پارێزەر بکاربینە (دەستگۆرکێن ژفرە ئیثیلین بکاربینە یێن بۆ جارەکێ بتنێ دهێنە بکارئینان) دەمێ تو کار ب هەر ڕووەکەکا چۆلی دکەی.**
- **دەستێن خۆ باش بشۆ پشتی تو سەرەدەریێ دگەل هەر ڕووەکەکێ یان بەشەکی ژڕووەکێ دکەی.** بلا دەستێن تە ب چاڤێن تە وڕوویێن تە نەکەڤن.
- **خۆ نە دەبەر دوکێلا ژسۆتنا هەر ڕووەکەکێ دەردکەڤیت ودوکێلا وی نەهەلکێشی.**
- **گولێن چ ڕووەکێن چۆلی یان ڕووەکێن دی نەکەی ئەگەر مامۆستایێ تە ژتە نەخازیت.**



## ڕزگاربوون ژپاشمایکان

- هەمی ڕووێن کاری و کەرەستێن خۆپاراستنێ باش پاقژ وپاك بکە لدویف ڕێنماییێن مامۆستای.
- هەمی ماددێن تیژ وبێن شکەستی ب هاڤێژە (پرتێن شووشەی وتەتێن تیژێن پیسبووی). هەروەسا ماددێن پێسبوویێن دی (زیندەیی و کیمیایی) ئەو ژی بۆ ناڤ جهێن تایبەت بۆ ویێ چەندێ لدویف ڕێنماییێن مامۆستای.

## خۆپاراستنا ساخلەمیێ

- دەستێن خۆ ژڕوویێن خۆ ودەڤێ خۆ دووربێخە.
- دەستێن خۆ باش بشۆ بەری ژتاقیگەهیێ دەرکەڤی.
- جلکێن پیسبووی ژبەرخۆ بکە، وجودا جودا بشۆ.
- دەمێ تو کار دکەی لسەر بەکتریا وزیندەوەرێن هوورێن وەکی وان، پشت ب ویێ تەکنیکارییێ ببەستە یا مامۆستاییێ تە بۆ تە ڕوونکری. پشکنینا چاندییێن زیندەوەرێن هوور بکە دناڤ سێنیکێن پتریدا بێی تو ڤەکەی.
- هەمی ماددە وچاندییێن تاقیکارییێ بۆ مامۆستاییێ خۆ بزڤڕینە داکو ب ڕێکەکا دروست بێنە دوورێخستن.



## خۆپاراستن ددەمێ گەرمکرنێدا

- ددەمێ گەرمکرنا ماددێن کیمیایی یان ماددێن کارلێکێ دگەلێکدا دکەن دبۆڕیێن تاقیکرنێدا. بۆڕیا تاقیکرنێ ئاراستەی چ کەسا نەکەی.
- گەرمکەرێن کارەبێ (هیتەر) بکاربینە. گۆڕیا ئاگری دهەوایدا بکارنەئینە. پشتڕاستبە ژهەبوونا سویچێ بڕینا کارەبێ وگلۆپا ئاماژەکرنێ لسەر هیتەری. هیتەری نەهێلی بێی چاڤدێری. گەرمکەرێن کحولی بکارنەئینە.
- جهێ بوتلێن ڤەمراندنا ئاگری وجهێ بەتەنیێن تایبەت ب ئاگربەربوونێڤە بزانە دتاقیگەهێدا. بلا بەفرلبەر دەستێ تەبیت بۆ بارێن ڕوودانا سۆتنان.
- میچینکی بکاربینە دەمێ تو تەتێن گەرم ڕادکەی. پتریا جاران تەن وەسا دیاردبن کو نە دگەرمن. و چ تەنان بدەستێ خۆ نە ڕاکەی ئەگەر تو یێ پشتڕاستنەبی ژساریيا وان.
- ماددێن دهێنە سۆتن دووربێخە ژژێدەرێن گەرمیێ.



## سلامەتیا دەستان

- دەمێ تو تەنەکی دبڕی بدەستێت خۆ نەگرە.
- دەستگۆرکێن پارێزەر بکاربینە دەمێ تو کار ب بۆیاغان یان ماددێن دگیراوێن کیمیاییدا یان ڕووەکێن چۆلی (یێن نەبەرنیاس) دکەی.



## خۆپاراستن ژکەلوپەلێن شووشەیی

- ئامێرێن شووشەیی یێن دەرزی بکارنەئینە. شووشا بوروسیلیکات یا بکێر گەرمگرنێ دهێت بکاربینە.
- هەوڵ نەدەی ب زۆری (ب خورتی) بۆڕیێن شووشەیی بێخییە ناڤ دائێخەرێ پلاستیکیدا بێی ڕێنماییان ژمامۆستای وەربگری.
- پرتێن شووشێن شکەستی ب میچینکان وفرچەی وگێزکی لابدە. وپاڤێژە دجهێن تایبەتدا کو لسەر نڤێسیە «ماددێن تیژ».



## خۆپاراستن ژگازان

- چ گاز وهەڵمان نەهەلکێشە. دفنا خۆ بەرەڤ چ ماددێن بێهندار نەبەی.
- ئەو ماددێن هەڵم وگاز ژێ دەردکەڤن، ل جهەکێ باگورگیا وی باشبیت کارلسەربکە، دگەل بکارئینانا بەردەڤکا هەلمێن کیمیایی.

# بکارئینانا تەکنیکارییێن تاقیگەهی ودیزاینێن تاقیکرنێن تاقیگەهی

1. **چالاکیێن تەکنیکارییێن تاقیگەهی** هاریکاریێ دکەت بۆ وەرگرتنا شارەزاییان دبواری تەکنیکارییێن تاقیگەهی بۆ زانستێن زیندەیی.
2. **چالاکیێن دیزاینێن تاقیکرنێن تاقیگەهی** پێتڤییە تو وان تەکنیکاریان ئەوێن دچالاکیێن تەکنیکارییێن تاقیگەهیدا فێربوویێ بکاربینی بۆ شیکرنا پرسیاران.

## کارکرن دجیهانا زانایێ زیندەزانییێدا

چالاکیێن تەکنیکارییێن تاقیگەهی ودیزاینێن تاقیکرنێن تاقیگەهی یێن هاتینە دانان دا بۆ تە دیار بکەت کا چەوا زیندەزانی یا گونجایە دگەل جیهانا ژدەرڤەی هۆلا خاندنێ. تو دێ ب ڕوولێ زانایەکێ چالاکێ زیندەزانییێ ڕابی. ودێ شارەزاییێ دتەکنیکارییێن بکارهاتی دتاقیگەهێن زیندەزانییێدا وەرگری. هەروەسا دێ شارەزاییێن کاری دجیهانا ڕاستەقینەدا ئەنجامدەی. بۆ نموونە وەکی دانانا پلانەکێ یا گەلەك داهات هەبن، وکارکرن وەك ئەندامەك دتیمەکێدا، ودانانا بودجەکێ وپابەندبوون پێڤە ونڤیسینا نامان ل مەیدانا کاراک.

### هزرێن ب مفا بۆ سەرکەفتنێ دکارێن تاقیگەهیدا

خۆ ئامادەکرن دێ هاریکاریا تە کەت دکاریدا ب شێوەکێ چالاك وهێمن، دەمێ تو کار دکەی چ لسەر تەکنیکارێن تاقیگەهی یان تو دیزاینێن تاقیکرنێن تاقیگەهی ئەنجامددەی.

- **دەقێ چالاکیا تاقیگەهی بخوینە** بەری بێیە دناڤ هولا خواندنێدا، دا بزانی کا دێ چکەی.
- **پێزانینێن تایبەت ب سلامەتیێڤە بخوینە ودتاقیگەهێدا بجهبینە**، وەکی ئەوا دلاپەرێن 40 تا 44 دا هاتین.
- **خشتێن داتایان ئامادە بکە** بەری بێیە دناڤ هۆلا خواندنێدا.
- **ێکسەر هەمی داتا وتێبینیان تۆمار بکە** دخشتێن خوێێن داتایاندا.
- **یەکین پیڤانێ یێن گونجای بکاربینە** هەر دەمێ تو داتایان تۆمار دکەی.
- **ڕێکخستنا مێزا کارێ خۆیێ تاقیگەهی بپارێزە**، وبلا ماددە لسەر کۆم نەبن.

## چالاکیێن تەکنیکارییێن تاقیگەهی

هەر چالاکیەکا تایبەت ب تەکنیکارێن تاقیگەهیڤە شیانێ ددەتە تە تو ڕاهێنانێ بکەی لسەر وان تەکنیکاریان ئەوێن دهێنە بکارئینان دلێگەریانادا دبوارێ زیندەزانییێدا، ئەوژی ب ڕێکا پێدانێ بۆ تە ب کریارەکێ کو یا پێکهاتی ژچەند پێنگاڤێن لدویڤێك کو دڤێت تو ئەنجامبدەی. گەلەك ژڤان تەکنیکاریان دپاشەڕۆژێدا دێ دچالاکیێن تاقیکرنێن تاقیگەهیدا بکارئینی. **وئەڤە ژی بۆ تە پشکێن کارێن تاقیگەهی یێن تایبەت ب تەکنیکارێن تاقیگەهیڤە و ب درێژی.**

1. **شارەزایی**، دێ وان تەکنیکاری وشارەزاییان دەستنیشان کەت یێن کو دێ فێرببیێ.
2. **داهاتێن فێرکاریێ**، دێ تە ئاگەهدارکەن ب ئەوا ژتە دهێتە چاڤەڕێکرن تو بجهبینی.

3. **مادده**، ليستا وان بەندان ديار دكەت يێن دێ تە پێتڤى پێ هەبن بۆ بجهئينانا كارێ تاقيگەهێ.
4. **ئارمانج**، خۆبەرهەڤكرن بۆ تاقيگەهێ.
5. **پاشينه**، نواندنا وان پێزانينايه يێن تە پێتڤى پێ هەين بۆ چالاكييا تاقيگەهێ.
6. **ئەنجامدان**، پێنگاڤەكێ لدويف پێنگاڤێ دابين دكەت، رێنمايێن پێتڤى بۆ تەمامكرنا چالاكييا تاقيگەهێ، وبيرئانينا رێنمايێن سلامەتيێ وهێمنيێ ئەوێن دڤێت تو پێگريێ پێ بكەى دابين دكەت.
7. **شلۆڤەكرن**، چەند بەندەكن هاريكاريا تە دكەن بۆ شلۆڤەكرنا تەكنيكارێن چالاكييا تاقيگەهێ وشلۆڤەكرنا داتايێن تە.
8. **دەرئەنجام**، چەند بەندەكن ژتە دخازن تو چەند بۆچوونەكا پێكبينى كو پشتبەستنێ بكەنە سەر تێبينيێن تە وئەو داتايێن تە كۆمكرين ددەمێ كارێ تاقيگەهيدا.
9. **بەرفرەهكرنا ئاسۆيێن هزركرنێ**، چەند بەندەكن دەليڤێ ددەتە تە بۆ ڤەديتنا گەلەك تشتان لدۆر بابەتێن گرێداى ب بابەتێ چالاكييا تاقيگەهيڤە.

## چالاكيێن ديزاينينێن تاقيكرنێن تاقيگەهێ

ئەڤ هەمى چالاكيێن تاقيگەهێ ژتە دخازن تو كريارەكا بجهئينانێ ئەنجامدەى بۆ چارەسەركرنا ئاريشەكێ. كريارێن بجهئينانێ ئەوێن تو پێشدێخى دێ پشتبەستنێ كەنە سەر وان كريارێن بجهئينانێ وتەكنيكاريان يێن تو دچالاكيێن تاقيگەهيێن پێشتردا يێن تايبەت ب تەكنيكارێن تاقيگەهيڤە فێربوويێ. هەروەسا لسەر تە پێتڤييە بريارێ بدەى دەربارەى وان ئامێرێن پێتڤى بۆ بكارئينانێ دپرۆژەيدا ودەستنيشانكرنا كۆژمێ پارەى. **وبەشێن چالاكيێ يێن تايبەت ب ديزاينێن تاقيكرنێن تاقيگەهيڤە يێن دڤان خالاندا هاتينە رِوونكرن**:

1. **داخازيا پێشوەخت**، تە ئاگەهدار دكەت لسەر چالاكيێن تەكنيكارێن تاقيگەهێ ئەوێن وان كريارێن بجهئينانێ بخۆڤە دگريت يێن لسەر چالاكيا تايبەت ب ديزاينا تاقيكرنا تاقيگەهێ دگونجيت.
2. **پێداچوون**، تە ئاگەهدار دكەت ب وان تێگەهان يێن دێ تو پێتڤى بيێ بۆ تێگەهشتنا چەوانيا تەمامكرنا چالاكيا تاقيگەهێ.
3. **ياداشت**، داخازا كارى لسەر چارەسەركرنا ئاريشەكێ يان ئەنجامدانا پرۆژەكى بخۆڤە دگريت.
4. **كاغەزا كارى**، ئاگەهداركرنەكە ژلايێ سەرپەرشتياريڤە، تە ئاراستە دكەت بەرەڤ ئەنجامدانا كارى، وان چارەسەريان يان رێنماييان پێشكێشى تە دكەن يێن دێ هاريكارييا تە كەن ددیزاینكرنا تاقيكرنەكا سەركەفتيدا يان دپرۆژەكێ سەركەفتيدا. هەروەسا كاغەزا كارى ئەڤان بخۆڤە دگريت: **ليستا هووربينيێ يا تايبەت ب نيشاندانا پێشكێشكرى**، دڤێت تو تەمامبكەى بەرى تو دەست ب ئەنجامدانا چالاكييا تاقيگەهێ بكەى، **ئەنجامدانێن گرێداى ب راپۆرتێڤە**، تە ئاگەهدار دكەت لسەر ئەوا دڤێت راپۆرتا تەيا تاقيگەهێ بخۆڤە بگريت. **رێنمايێن سلامەتى وئێمناهيێ** ئاماژێ ددەتە وان بەرهەڤيان كو دڤێت تو پێگيريێ پێ بكەى دەمێ تو چالاكييا تاقيگەهێ ئەنجامددەى. **رێكێن خۆرزگاركرنێ ژپاشمايكان** تە ئاگەهدار دكەن لسەر چەوانيا خۆرزگاركرنێ ژماددێن تە بكارئينايين.

**5. مادده‌ و مه‌زاختن** لیستەكێ بخۆڤە دگریت یا وان تشتێن كو دبیت تو پێتڤی بێ بۆ تەمامكرنا چالاكیێ

## دڤێت تو چبكەی بەری ئەنجامدانا چالاكیەكێ بۆ تاقیكرنەكا تاقیگەهی

بەری رێ بدەتە تە بۆ دەستپێكرنا چالاكیا تایبەت ب دیزاینكرنا تاقیكرنەكا تاقیگەهی دڤێت تو نیشانەكێ پێشكێش بكەی كو وێ پرسیارێ بخۆڤە بگریت یا كو دڤێت تو بەرسڤێ لسەر بدەی، وهەروەسا ئەڤانە بخۆڤە دگریت، كریارا ئەنجامدانێ ئەوا دێ بكارئینی، وخشتەكێ داتایان بدرێژی، ولیستەك ب هەمی ماددێن پێشنیاركری. بەری دەست ب نڤێسینا نیشانا خۆ بكەی پێگیریێ ب ڤان پێنگاڤان بكە:

**چالاكیا تاقیگەهی بخوینە،** وهەر چارەسەریەكا تو دبینی بلەز تۆمار بكە.

**لبەرچاڤ وەربگرە** كو دڤێت تو كریارێن پیڤانێ وتێبینیكرنێ ئەنجامبدەی بۆ چارەسەریا كێشەكێ.

**بیرا خۆ بینەڤە ل چالاكیێن تاقیگەهێن تایبەت ب تەكنیكارییێن تاقیگەهیڤە ئەوێن بەری نۆكە تو بێ رابووی وئەوێن** پێتڤی ب كریارێن پیڤانێ وتێبینییێن وەكهەڤ هەی.

- **وەسا هزركە كو تو یێ كار دكەی لدویڤ كریارەكا ئەنجامدانێ یا دیاركری،** پێگیریێ ب هەر پێنگاڤەكێ ژپێنگاڤان بكە. وهەمی تشتێن تە پێتڤی پێ هەبیت پەیدا بكە.

## دڤێت تو چبكەی پشتی ئەنجامدانا چالاكیا دیزاینكرنا تاقیكرنەكا تاقیگەهی

پشتی تو ژچالاكیێ بدوماهیك دهێی، راپۆرتەكێ ئامادە بكە لدویڤ ئەوا دكاغەزا كاریدا هاتی، دبیت راپۆرت شێوێ نامەكێ بیت كو لاپەرەكی یان دوو لاپەران بخۆڤە بگریت وبهێتە ئاراستەكرن بۆ خودانێ داخازیێ، دگەل لیستا مەزاختنێ.

# لیستا سەرەکیا ماددان لدویڤ چالاکیا تاقیگەهێ

### چالاکیا کریاریا بەندێ 1
**بکارئینانا سیستەمێ جیهانیێ یەکان**

| ماددێن پێڤی | بڕا پێڤی |
|---|---|
| هەلگرێ بازنی یان هەلگرێ گۆلوپی | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| خیزێ ڕەنگ تاری | 75 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |
| خیزێ ڕەنگ ڤەبی | 75 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |
| زەیتا گەنمۆکان | 25 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |
| دەمژمێرەکا دەمگر | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| دەستگورکێن پاراستنێ ژگەرمێ | 1 بۆ هەر خوێندکارەکێ |
| کوپەکێ پلاستیکیێ ڕوون | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| کوپەکێ پلاستیکیێ ب بەرفرەهیا 150 mL | 4 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| ئاڤ | 25 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |
| بۆڕیەکا پلەدار ب بەرفرەهیا 1100 mL | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| ژێدەرەکێ ڕووناهیێ | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| تەرازیەك | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| گەرمپیڤەکا سلیزی تژی کحول | 2 بۆ هەر گروپەکێ |
| کاغەزەکا وێنێ داتایی | 1 بۆ هەر خوێندکارەکێ |

### چالاکیا کریاریا بەندێ 2
**ڤەدیتنا ئاوێتێن ئەندامی دخوارنادا**

| ماددێن پێڤی | بڕا پێڤی |
|---|---|
| بۆڕیەکا تاقیکرنێ | 9 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| گەرمکەرەکێ کارەبایی | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| دەستگۆرك | 1 بۆ هەر خوێندکارەکێ |
| پێنڤیسێ هێلکاری | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| کوپەکێ ب بەرفرەهیا لیترەکێ | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| پێڤەنیسێن پێناسەکرنێ | 9 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| ئاڤا کانزای | 50 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |
| مژۆکەك | 9 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| گیراوێ گلۆکۆزێ | 2 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |
| گیراوێ بێنێدیکت | 15 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |
| گیراوەکێ نەنیاس | 2 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |
| بۆڕیەکا پلەدار ب بەرفرەهیا 10 mL | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| بەرکۆشکێ تاقیگەهێ | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| بەرچاڤکێن پاراستنێ | 1 بۆ هەر خوێندکارەکێ |
| هەلگرەکێ بۆڕیان | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| زەیتا ڕووەکی | 1 mL بۆ هەر گروپەکێ |
| بگرەکێ بۆڕیان | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| گیراوێ سپیلکا هێکێ | 4 mL بۆ هەر گروپەکێ |
| گیراوێ سودان III | 1 mL بۆ هەر گروپەکێ |
| گیراوێ سولفاتێ مسی | 1 mL بۆ هەر گروپەکێ |
| گیراوێ هایدرۆکسیدێ سۆدیۆم | 12 mL بۆ هەر گروپەکێ |
| تێکەلکەرەکێ شووشەیی | 9 بۆ هەر گروپەکێ |

### چالاکیا کریاریا بەندێ 3
**بەراوردیکرنا خانێن گیانەوەران دگەل خانێن ڕووەکان**

| ماددێن پێڤی | بڕا پێڤی |
|---|---|
| سلایدێن ڕووکەشە خانان | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| سلایدێن نموونێن نەنیاس | 3 بۆ هەر گروپەکێ |
| سلایدێن هویربینی وسلایدێن داپۆشینێ (کەڤەر) | 1 قالك بۆ هەمی پولێ |
| چەقێن ڕووەکێ ئیلودیا | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| شووشەك گیراوێ یودی تێدا بیت دگەل دلوپێنەرەکی | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| هویربینا ڕووناهیێ | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| بەرکوشکێ تاقیگەهێ | 1 بۆ هەر خوێندکارەکێ |
| بەرچاڤکێن پاراستنێ | 1 بۆ هەر خوێندکارەکێ |

### چالاکیا کریاریا بەندێ 4
**تێبینیکرنا دابەشبوونا وەکهەڤ دخانێن ڕووەکیدا**

| ماددێن پێڤی | بڕا پێڤی |
|---|---|
| هویربینەکا ڕووناهیێ یا ئالۆز | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| سلایدەکێ هویربینێ یێ ئامادەکریێ درێژە برگەیەکا گوپیتکا ڕەها پیڤازێ | 1 بۆ هەر گروپەکێ |

### أ–1 بەراورديكرن دناڤبەرا زيندەوەران وتشتێن نە زيندى

| مادديێن پێدڤى | بڕا پێدڤى |
|---|---|
| بەردبوويەكێ مەزن | 1 بۆ هەر پۆلەكێ |
| ئەشەنە (برگەيەك) – سلايدەكێ هويربينێ | 1 بۆ هەر پۆلەكێ |
| تۆڤێ مانگا | 1 بۆ هەر گروپەكێ |
| پەنيرێ شين Blue cheese | بڕا كەڤچكەكێ چايێ بۆ هەر گروپەكێ |
| كولى | 1 بۆ هەر پۆلەكێ |
| بەرێ سڤك | 1 بۆ هەر پۆلەكێ |
| هێڤينێ زيندى | 1گرام بۆ هەر گروپەكێ |
| كرمێ ئەردى يێ زيندى | 1 بۆ هەر گروپەكێ |
| ماسيێ زێرينێ زيندى | 1 بۆ هەر گروپەكێ |
| سلايدەكێ داپۆشينێ– يێ پلاستيكى 22 mm | 1 بۆ هەر گروپەكێ |
| سلايدێن هويربينى– يێ ڕێكخستى | |
| پێشوەخت | 5 بۆ هەر گروپەكێ |
| ئامانەكێ ئاگارێ نيشاستەى | بۆردەك بۆ هەر گروپەكێ |
| فلين (تەبەدۆر)–پيڤانا 2 | 1 بۆ هەر پۆلەكێ |
| ماست | ب بڕا كەڤچكەكێ چايێ بۆ هەر گروپەكێ |
| هويربين | 1 بۆ هەر گروپەكێ |
| هويربينا تەندار | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| ڕووەكێ «كۆليۆس»ێ زيندى | 1 بۆ هەرپۆلەكێ |

### أ –2 چێكرنا نموونێن خانان: ڕووبەرێ ڕووى لدويڤ قەبارەى

| مادديێن پێدڤى | بڕا پێدڤى |
|---|---|
| ئاميرێ بژمێرێ | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| خيزێ سپيێ هوير | 5گرام بۆ هەر گرۆپەكێ |
| شريتا پێڤەنسيانێ، يا ڕوون | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| ڕەحەتى–ژ پرۆپيلينى 58 mm | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| تابلۆيەكێ كارتۆنێ 70 cm × 55 cm | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| بۆريەكا پلەدار ب فرەهيا 100 mL | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| ڕاستەك 5 cm يێ پلاستيكيێ سپى | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| پێبڕكەك بۆ تەشريحێ (تولكاريێ) | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |

### أ–3 بكارئينانا ڕێكا وەرگرتنا نموونان هەڕەمەكى

| مادديێن پێدڤى | بڕا پێدڤى |
|---|---|
| ئامانەك، 8 cm × 20.5 cm | 2 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| ڕاستەكێ 15 cm يێ پلاستيكيێ سپى | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |

### أ–4 گرێدان دناڤبەرا پێكهاتنا خانێ وفرمانێ وێدا

| مادديێن پێدڤى | بڕا پێدڤى |
|---|---|
| سلايدەكێ ئامادەيێ خوينا مرۆڤى | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| هويربين | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| پێبڕكەكا تەشريحێ | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| كاغەز | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |

### ب–1 پێكهاتێن خانێ

| مادديێن پێدڤى | بڕا پێدڤى |
|---|---|
| ئيلوديايا زيندى | بەلگەك بۆ هەر گرۆپەكێ |
| چاندنا «ئەميبا» Amoeba proteus | 1 بۆ هەر پۆلەكێ |
| سلايدێن داپۆشينێ، يێن پلاستيكى 22 mm | 2 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| سلايدەكێ ئامادەيێ پێستێ بەقێ | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| سلايدەكێ ئامادەيێ تۆڤێ (سپێرمێ) بەقێ | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| سلايدەكێ ئامادەيێ خوينا بەقێ | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| سلايدەكێ هويربينێ – يێ پاقژكرى پێشوەخت | 2 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| مژوكەكا 3 ئينج شووشەى – دلوپێنەرەك | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| هويربين | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| بەركۆشكێ تاقيگەهێ،پۆلى ئەثيلين – بۆ جارەكێ بكارئينانێ | 1 بۆ هەر خوێندكارەكى |
| بگرێ بۆڕيان | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |
| گيراوێ سپيلكا هێكێ | 4 mL بۆ هەر گرۆپەكێ |
| گيراوێ سوودان III | 1 mL بۆ هەر گرۆپەكێ |
| گيراوێ سولفاتێ مسى | 1 mL بۆ هەر گرۆپەكێ |
| گيراوێ هايدرۆكسيدێ سۆديۆمى | 12 mLبۆ هەر گرۆپەكێ |
| تێكەلكەرەكێ شووشەى | 9 بۆ هەر گرۆپەكى |
| شووشەكێ گيراوێ يۆدى يێ دلوپێنەر پێڤە | 1 بۆ هەر گرۆپەكێ |

هویرببنا ڕووناهییێ ........................ 1 بۆ هەر گرۆپەکێ
بەرکوشکێ تاقیگەهێ ............... 1 بۆ هەر خوێندکارەکی
بەرچاڤکێن پارێزەر ................. 1 بۆ هەر خوێندکارەکی

### ب-2 دابەشبوونا یەکسان

| ماددێن پێدڤی | بڕا پێدڤی |
|---|---|
| سلایدەکێ ئامادەیێ دابەشبوونا یەکسان دگیانەوەریدا «پلاستولا ماسی» | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| سلایدەکێ ئامادەیێ دابەشبوونا یەکسان دڕووەکاندا | 1 بۆ هەر گروپەکێ |
| هویربین | 1 بۆ هەر گروپەکێ |

### ج-1 بکارئینانا هویرببینێ

| ماددێن پێدڤی | بڕا پێدڤی |
|---|---|
| ئیلۆدیا یا زیندی | بەلگەك بۆ هەر گروپەکێ |
| دەرزیکەکا لێدانێ یا دەستکەکێ داریتی هەبیت | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| حەزازیەکێ زیندی | 1 بۆ هەر پۆلەکێ |
| دەزیەکێ نایلۆنی – بەکەرە 176 cm | 4 cm بۆ هەر گرۆپەکێ |
| سلایدێن داپۆشینی–یێن پلاستیکی 22 mm | 2 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| سلایدەکێ هویربینی – پاقژکەرییێ پێشوەخت | 2 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| سلایدەکێ ئامادەیێ دابەشبوونا یەکسان دڕووەکاندا | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| ڕۆژنامەك | 1 بۆ هەر پۆلەکێ |
| ئاڤ | 1 mL بۆ هەر گرۆپەکێ |

مژوکا 7.5 cm یا شووشەیی– دلوپێنەر ....... 1 بۆ هەر گرۆپەکێ
هویربین ................................. 1 بۆ هەر گرۆپەکێ
هویربینا تەنداری، یا خودان دیتنەکا بەرفرەھ . 1 بۆ هەر گرۆپەکێ
پێبڕکەکا تەشریحێ – جۆرەکێ ئەرزانێ ئامادەکری بۆ خوێندکاری ...... 1 بۆ هەر گرۆپەکێ
بگرەك (گازکەك) بۆ تەشریحێ، یێ ناڤنجی . 1 بۆ هەر گرۆپەکێ
کەفیکەکا کاغەزێ – یا پێچای ب دوو چینان. پێچانەك ب 100 پارچان ..... 1 بۆ هەر گرۆپەکێ
کاغەزا پاقژکرنێ یا هاوێنان .......... 1 کاغەز بۆ هەر گرۆپەکێ

### ج-2 هێلکارییێ کرۆمۆسۆمان

| ماددێن پێدڤی | بڕا پێدڤی |
|---|---|
| شریتا پێڤە نیسیانێ یا ڕوون – دگەل ئامیرێ تایبەت ب درێژکرنا وێڤە | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| شێوێ هێلکارییێ کرۆمۆسۆمێن مرۆڤی | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| کۆمەڵەکا بەلاڤا کرۆمۆسۆمێن نێرێ مرۆڤی | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| ڕاستەکێ 15 cm، یێ سپی | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |
| پێبڕکەکا تەشریحێ، جۆرەکێ ئەرزانێ ئامادەکری بۆ خوێندکاری | 1 بۆ هەر گرۆپەکێ |

ناڤ ________________

بەروار ________ پۆل ________

# بەندێ 1

چالاکیا زەنگینکرنێ

## بکارئینانا سیستەمێ جیهانیێ یەکان

### دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- **دەربرینێ** ژپیڤەرێن یەکێن سیستەمێ SI دکەت.
- گەرمپیڤێ **دخوینیت**.
- ب بکارئینانا بۆریا پلەدار قەبارێ شلەی **دپیڤیت**.
- ب بکارئینانا تەرازیێ بارستەی **دپیڤیت**.
- چرپیا دوو شلێن جیاواز **دەستنیشاندکەت**.

### شارەزایی

- ئەنجامدانا پیڤانێ
- هەژمارتن

### ماددە

- 75 mL ژخیزێ رەنگ ڤەبووی
- 75 mL ژخیزێ رەنگ تاری
- بۆریەکا پلەدار ب بەرفرەهیا 1100 mL
- گەرمپیڤێن سیلیۆسییێن تژی کهول، ژمارە 2
- کوپێن پلاستیکی ب بەرفرەهیا 150 mL ژمارە 4
- کاغەزا وێنێ داتایی
- دەمژمێرەکا دەمگر یان هشیارکەرەك
- دەستگۆرکێن پاراستنا گەرمیێ
- ژێدەرێ رۆناهیێ
- هەلگرەکێ ئەلقەیی یان هەلگرەکێ گلۆپێ
- 25 mL ژزەیتا گەنموکا
- 25 mL ئاڤ
- کوپەکێ پلاستیکیێ روون
- تەرازی

### پاشینە

**1.** هێمایا SI چ دگەهینیت؟

**2.** هەر حەفت یەکێن سیستەمێ SI بنەرەتی بژمێرە.

**خشتێ أ پلا گەرمیا خیزی**

| دەم « min » | پلا گەرمیا خیزی ( ºC) | |
|---|---|---|
| | خیزێ رەنگ تاری | خیزێ رەنگ ڤەبووی |
| دەستپێك | | |
| 1 | | |
| 2 | | |
| 3 | | |
| 4 | | |
| 5 | | |
| 6 | | |
| 7 | | |
| 8 | | |
| 9 | | |
| 10 | | |

## ئەنجامدان

### بەشێ (أ) پیڤانا پلا گەرمیێ

1. دراپۆرتا خۆیا تاقیگەهیدا خشتەکێ زانیاریان ئامادە بکە وەکو وی خشتێ أ بیت ئەوێ دیار دلاپەرێ بەری ڤی دا.

2. ب هاریکاریا بۆریەکا پلەدار 75 mL یێن خیزێ ڕەنگ ڤەبووی بپیڤە وخالیکە کۆپەکێ پلاستیکییێ بچووك. ڤێ کریارێ دگەل خیزێ ڕەنگ تاری ژی دا دووبارە بکە دگەل کۆپەکێ پلاستیکییێ دی.

3. ڕوویێ خیزی وەکو ئێك لێبکە ب ڕێکا دانانا کۆپی لسەر مێزا خۆ و ب پاڵدانا وی کۆپی بینی وبەەی.

4. گەرمپیڤەکێ دانە دناڤ هەر کۆپەکێدا. پێدڤیە هێلا سفرا گەرمی گەرمپیڤی لسەر ئاستێ ڕوویێ خیزی بیت، وەکو دیار دشێوێ خوارێدا. هەکە پێدڤی بوو ڕوویێ خیزی دووبارە ڕاستبکەڤە.



5. **هشیاربە: دەمێ تو گلۆپێ بکاردئینی دەستگۆرکێن پاراستنا گەرمیێ بکە دەستێن خۆ. گلۆپ دێ گەلەك گەرمبیت وچێدبیت دەستێن تە بسۆژیت.** هەلگرەکێ ئەلقەیی یان هەلگرەکێ گلۆپێ بکاربینە دا گلۆپێ ب بلنداهیا 9 cm نێزیکی سەر ڕوویێ خیزی دانی، هەر وەکو دوێنەیدا دیار. پشتڕاستبە گلۆپ ڕووناهیێ لسەر هەردوو ئامانان وەکو ئێك دابەشدکەت.

6. بەری هەلکرنا گلۆپێ، پلا گەرمیا دەستپێکا هەر کۆپەکێ خیزی دخشتێ زانیارێن تایبەت ب تەڤە تۆمار بکە.

7. تێبینیا دەمی بکە یان دەمژمێرا کاتگر دەستپێبکە دەمێ گلۆپ ڕووندبیت. گلۆپ دێ گەرمبیت ودێ خیزی گەرمکەت. هەر خولەکەکێ پلا گەرمیا خیزێ دهەر ئامانەکیدا بخوینە بۆ ماوێ 10 خولەکان. پشتی هەر خولەکەکێ پلا گەرمیا خیزی دخشتێ خۆدا تۆمار بکە.

### بەشێ (ب) بەراوردیكرنا چڕیا زەیتێ وئاڤێ

**8.** دڕاپۆرتا خۆیا تاقیگەهیدا خشتەكێ زانیاریان ئامادە بكە وەكو خشتێ (ب) بیت.

**خشتێ ب چڕیا دوو شلان**

| | | |
|---|---|---|
| أ – بارستاییا كۆپێ زەیتێ یێ ڤالا | | g ________ |
| ب– بارستەیا كۆپێ ئاڤێ یێ ڤالا | | g ________ |
| ج– بارستەیا كۆپی وزەیتێ | | g ________ |
| د– بارستەیا كۆپی و ئاڤێ | | g ________ |
| هـ– قەبارێ زەیتێ | | 25 mL |
| و– قەبارێ ئاڤێ | | 25 mL |
| | هەژمارتنا بارستاییا دروست | |
| زەیت | بەندێ ج –بەندێ أ = | ________g |
| ئاڤ | بەندێ د –بەندێ ب = | ________g |

**9.** (زەیت) لسەر كۆپەكێ پلاستیكیێ پاقژ بنڤێسە، و(ئاڤ) لسەر یێ دی بنڤێسە. تەرازیەكێ بكاربینە بۆ پیڤانا بارستەیا هەر كۆپەكێ پلاستیكی، وبڕا وی دخشتێ زانیاریاندا تۆمار بكە.

**10.** بۆڕیەكا پلەدار بكاربینە بۆ پیڤانا 25 mL یێن زەیتا گەنموكان وبكە كۆپێ (زەیت) لسەر هاتیە نڤێسین. تەرازیەكێ بكاربینە بۆ پیڤانا بارستەیا وی كۆپێ پلاستیكی یێ زەیتا گەنموكان تێدا، ودخشتێ خۆدا تۆمار بكە.

**11.** بوریەكا پلەدارا پاقژ بكاربینە بۆ پیڤانا 25 mL ژئاڤێ وئاڤێ ژی بكە كۆپێ (ئاڤ) لسەر. تەرازیەكێ بكاربینە بۆ پیڤانا بارستەیا وی كۆپی یێ ئاڤ تێدا وڤێ بارستەیێ دخشتێ زانیاریاندا تۆمار بكە.

**12.** دا كو بارستەیا زەیتێ یا دروست ب دەست تە بكەڤیت، بارستەیا كۆپێ ڤالا ژبارستەیا كۆپی وزەیتێ پێكڤە بكە دەر (ژێببە).

**13.** دا چڕیا زەیتێ ب دەست تە بكەڤیت، بارستەیا زەیتێ دابەشبكە لسەر قەبارێ وێ هەر وەكو ئەڤ هاوكێشا خوارێ دیار دكەت:

$$\text{چڕیا زەیتێ} = \frac{\text{بارستەیا زەیتێ}}{\text{قەبارێ زەیتێ}} = \text{g/mL} \ ______$$

**14.** دا كو بارستەیا ئاڤێ ب دەستخۆڤە بینی، بارستەیا كۆپێ ڤالا دەركە ژبارستەیا كۆپی وئاڤێ پێكڤە.

**15.** دا كو چڕیا ئاڤێ ب دەستخۆڤە بینی، بارستەیا ئاڤێ دابەشبكە لسەر قەبارێ ئاڤێ، هەر وەكو هاوكێشا خوارێ دیار دكەت:

$$\text{چڕیا ئاڤێ} = \frac{\text{بارستەیا ئاڤێ}}{\text{قەبارێ ئاڤێ}} = \text{g/mL} \ ______$$

**16.** زەیتیێ وئاڤێ پێكڤە تێكەلبكە دكۆپیێ ڕووندا ودیتنێن خۆ دڕاپۆرتا خۆ یا تاقیگەهیدا تۆمار بكە.

**17.**  وان ئامیران پاقژ بكە یێن تە بكارئینایین ودەستێن خۆ بشۆ بەری تو تاقیگەهێ بجه بهێلی.

## شلۆڤەكرن ودەرئەنجام

**1.** وێنەكێ داتایێ ژوان وێنان یێن تە دبەشێ (أ) دا كۆمكرین وێنە بكە. دەمی لسەر تەوەرێ سینی ( x-axis ) وپلا گەرمییێ لسەر تەوەرێ صادی ( y-axis) تۆمار بكە.

**2.** ب پشتبەستن ب زانیارییێن تە دخشتێ (أ) دا، ئەو چ پەیوەندیە تە دیتی دناڤبەرا ڕەنگی ومێژتنا گەرمییێدا؟

**3.** چەوا چێدبیت ڕەنگێ وان جلكێن تو بكەیە بەرخۆ كار بكەتە سەر چەنداتیا گەرمكرنا تە دڕۆژەكا هەتاڤدا، پلا گەرمیا وێ 32°C بیت؟

**4.** دەمێ تە زەیت دگەل ئاڤێ دكۆپیێ ڕووندا تێكەلكرین تە تێبینیا چ كر دبەشێ (ب) دا؟ تێبینییێن خۆ گرێدە ب وان چڕیانڤە یێن تە بۆ هەردوو شلان هژمارتین (پیڤاین).

**5.** ژبهایێ چڕیا بەفرێ چ دیار دبیت هەكە تە دیت ب سەر ئاڤێ دكەڤیت؟

**6.** ئەكەر تە خەلەتیكر دخواندنا پیڤانا قەبارەی دبۆریا پلەداردا بهایێن چڕیێ دێ چەوان كار لسەر بهایێ چڕیێ كەن.

## ڤەكۆلینەكا زێدەتر

سفكەبەر بەرەكێ ڤۆلكانیە چڕیا وی كێمترە ژ 1.00 g/cm³. دێ چەوان شێی ڤێ چەندێ سەلمێنی هەكە تە ترازیەك نەبیت بۆ پیڤانا كێشا ڤی بەری؟ ( ئاماژە : چڕیا ئاڤێ 1.00 g/ cm³ ).

داهاتێن فێرکاریێ

پرۆگرامێ تاقیگەهێ

چالاکیێن کریاریێن بەندان

ناڤ ________________

بەروار __________ پۆل __________

# بەندێ 2

چالاکیا بنەڕەتی

## دیارکرنا ئاویێتێن ئەندامی دناڤ خوارناندا

### دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- هەبوون یان نەبوونا ماددێن خوراکیێن **دیارکری** دگیراوەکیدا دیاردکەت یێ پێکهاتنەکا کیمیاییا نەدیار هەبیت.
- تاقیکرنێن کیمیایی ئەنجامددەت تێدا هندەك مادده دهێنە بکارئینان دبێژنێ ناسەرەوە Indicators.

### شارەزایی

- تاقیکرن
- تێبینی
- پیڤان

### مادده

- بەرکۆشکێ تاقیگەهێ
- بەرچاڤکێن پاراستنێ
- دەستگۆرك
- کوپەکێ ب بەرفرەهیا لیترەکێ
- گەرمکەرەکێ کارەبایی
- 9 بۆڕێن تاقیکرنێ
- پێڤەنیسێن نیاسینێ
- پێنڤیسێ هێلکاری
- بۆڕیەکا پلەدار ب فرەهیا 10 mL
- گیراوێ بێنێدیکت Benedict solution
- 9 مژۆك ژجۆرێ دلۆپێنەر
- گیراوێ گلۆکۆزێ
- گیراوەکێ نەنیاس
- ئاڤا دلۆپاندی
- 9 تێکەلکەرێن شووشەی بۆ تێکڤەدانێ
- بگرەکێ بۆڕیان
- هەلگرەکێ بۆڕیان
- گیراوێ سپیلکا هێکێ
- گیراوێ هایدرۆکسیدێ سۆدیۆمی
- گیراوێ سۆلفاتێ مسی
- زەیتا ڕووەکی
- گیراوێ سوودان III

### پاشینە

1. پتریا خوارنان تێکەلەك ژکاربۆهیدارتی وپرۆتینی وچەوری یێن تێدا هەین وئەوژی وەکو ماددێن خوراکیێن بنەڕەتیێن زیندەوەرانە. هندەك خوارن، وەکو شەکرا خوارنێ، ماددەکێ خوراکی بتنێ ژڤان ماددان یێ تێدا هەی.
2. دڤێ چالاکیێدا هندەك ماددێن کیمیایی دێ بکارئینی دبێژنێ ناسەرەوە، بۆ زانینا هەبوونا ماددێن خوراکیێن دیارکری دگیراوەکێ نەنیاسدا (نەدیاردا)، ئەوان ژی ب ڕێیا گوهۆڕینا وی ڕەنگێ ناسەرەوە پەیدا دکەت.

بجهئینان

**3.** گیراوێ پێنبێدیکت دهێتە بکارئینان بۆ پشتڕاستبوونێ ژهەبوونا تاکە شەکران، وەکو گلۆکۆزی. تێکەلەکێ هایدرۆکسیدێ سۆدیۆمی وسۆلفاتێ مسی کار دکەت بۆ پشتڕاستکرنا هەبوونا هندەك پرۆتینان. دبێژنە ڤێ کریارێ تاقیکرنا بیوریت Biuret test. و سودان III بکاردهێت بۆ پشتڕاستبوونێ ژهەبوونا چەوریان.



**هشیاربە! بەرکۆشکێ تاقیگەهێ بکە بەرخۆ، بەرچاڤکێن پاراستنێ بکە بەر چاڤێن خۆ ودەستگۆرکان بکە دەستێن خۆ. دێ ب ڤی کارێ تاقیگەهی ڕابی، تێدا دێ ماددێن کیمیایی بکارئینی چێدبیت زیانێ بگەهیننە پیست وچاڤێن تە، یان چێدبیت ب جلك وپیستێ تەڤە ب نیسیێت. دەمێ ماددەکێ کیمیایی دکەڤیتە سەر پیستێ تە یان جلکێن تە، پێدڤیە تو بلەز بشۆی وبلەز داخازا مامۆستایێ خۆ بکەی. دەمێ ماددەکێ کیمیایی دچیتە دچاڤێن تەدا ئێکسەر ل جهێ شووشتنا چاڤان ب ئاڤێ بشۆ وداخازا مامۆستایێ خۆ بکە.**

دەمێ تو هەر تاقیکرنەکێ ئەنجامددەی داتایان دراپۆرتا تاقیگەهیا خۆیا تایبەتا ڕێکخستیدا بنڤێسە ب شێوێ وی خشتێ دبنێ لاپەریدا هاتی.

## تاقیکرنا 1

**1.** **هشیاربە! دەستێ خۆ نەکە گەرمکەرێ کارەبایی، بگران بکاربینە بۆ ڤەگوهاستنا تشتێن گەرم یان لڤاندنا وان، کارەبێ ژگەرمکەری ببڕە دەمێ تو ژبکارئینانا وی تەمامدبی. گەرمکەری گرێنەدە یان ژکارەبێ ڤە نەکە هەکە دەستێن تە دتەڕبن.**

حەمامەکا ئاڤێ Water bath ئامادە بکە ب دانانا نیڤ لیترا ئاڤێ دکۆپەکێ ب فرەهیا لیترەکێدا. کۆپێ ئاڤێ دانە سەر گەرمکەری وهەتا پلا کەلاندنێ گەرمبکە.

**2.** کارتا پێڤەنیسیانێ «گلوکوز—1» دانە سەر بۆریەکا تاقیکرنێ، وکارتا پێڤەنیسیانێ «نەنیاس —1» لسەر بۆریا دووێ یا تاقیکرنێ، وکارتا پێڤەنیسیانێ «ئاڤ —1» لسەر بۆریا سیێ یا تاقیکرنێ. دەمێ بکارئینانا بۆریا پلەدار، 5 mL ژگیراوێ بێنێدیکتی ب هەلگرە وبکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «گلۆکۆز—1». هەمان کریارێ دووبارە بکە ب زێدەکرنا هەر پێنج ملیلیتران بۆ سەر هەر بۆریەکا تاقیکرنێ: «نەنیاس—1» و «ئاڤ —1».

**3.** ب ڕێیا بکارئینانا مژۆکا دلۆپێنەر یان دلۆپێنەرا چاڤان، 10 دلۆپێن گیراوێ گلۆکۆزی بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «گلۆکۆز—1». و ب ڕێیا بکارئینانا مژۆکەکا دلۆپێنەرا دووێ 10 دلۆپێن گیراوێ نەنیاس بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «نەنیاس—1». مژۆکا دلۆپێنەرا سێیێ بکاربینە بۆ زێدەکرنا 10 دلۆپێن ئاڤا دلۆپاندی بۆ سەر بۆریا تاقیکرنێ «ئاڤ —1». پێکهاتێن هەر بۆریەکا تاقیکرنێ ب هاریکاریا وەرگێرەکێ (تێکەلکەرەکێ) پاقژ تێکەل بکە. (گەلەکا گرنگە تو گیراوێن بەرهەڤکری بۆ تاقیکرنێ پیس نەکەی ئەوژی ب بکارئینانا هەمان مژۆکێ

**دیارکرنا ماددێن خۆراکیێن دیارکری ب هاریکاریا ناسەرەوێن کیمیایی**

| تاقیکرن | ماددێ خۆراکی دگیراوێ تاقیکریدا | جینا ماددێ خۆراکی (پرۆتین، چەوری، .... هتد) | ئەنجامێ نموونا بەرنیاس | ئەنجامێ نموونا نە بەرنیاس | ئەنجامێ ئاڤا دلۆپاندی |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | | |
| 2 | | | | | |
| 3 | | | | | |

یان هەمان تێکەلکەری. بۆ گیراوەکێ زێدەتر، مژۆکەکا دلۆپێنەر یان تێکەلکەرەکی بتنێ بکاربینە بۆ هەر گیراوەکێ تو تاقیکرنێ لسەر دکەی).

**.4** دەمێ ئاڤ دکەلیت، بگری بکاربینە بۆ دانانا بۆرێین تاقیکرنێ دناڤ حەماما ئاڤێدا. بۆرێین تاقیکرنێ گەرمبکە وبهێلە بۆ خولەکەکێ یان دوو حۆلەکان بکەلیت.

**.5** **بۆرێین تاقیکرنێ ب دەستێ خۆ نەگرە دەمێ دگەرم بن**، بگری بکاربینە بۆ ڤەگۆهاستنا وان ژحەماما ئاڤێ، ودانە سەر هەلگرێ بۆرێین تاقیکرنێ. دەمێ ئەڤ بۆریە سار دبن، دێ نیشتویەکێ پرتەقالی یان سۆر دروستبیت هەکە برێن زۆرێن گلۆکۆزی هەبن. لێ هەکە برێن گلۆکۆزی دکێمبن دێ نیشتویەکێ زەر یان کەسك دروستبیت. ئەنجامێن تو گەهشتییێ دخشتێ زانیاریاندا بینە خوار (بنڤێسە).

## تاقیکرنا 2

**.6** کارتا پێڤەنیسیانێ «سپیلکا هێکێ –2» دانە سەر بۆریەکا تاقیکرنێ یا پاقژ، وکارتا «نەنیاس –2» دانە سەر بۆریەکا دی، وکارتا پێڤەنیسیانێ «ئاڤ –2» لسەر بۆریا سێیێ. ب هاریکاریا مژۆکەکا دلۆپێنەر 40 دلۆپێن گیراوێ سپیلکا هێکێ بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «سپیلکا هێکێ –2». پاشی ب هاریکاریا مژۆکەکا دلۆپێنەرا دی 40 دلۆپێن گیراوێ نەنیاس بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «نەنیاس –2». و ب هاریکاریا مژۆکەکا دلۆپێنەرا سێیێ، 40 دلۆپێن ئاڤێ بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «ئاڤ –2».

**.7** 40 دلۆپێن گیراوێ هایدرۆکسیدێ سۆدیۆمی بکە سەر هەر بۆریەکێ ژبۆرێین تاقیکرنێ. ب هاریکاریا تێکەلکەرەکێ پاقژ پێکهاتێن هەر بۆریەکا تاقیکرنێ تێکەلبکە.

**.8** هندەك دلۆپێن سولفاتێ مسی لسەر بۆریا تاقیکرنێ «سپیلکا هێکێ –2» دلۆپ دلۆپ زێدە بکە. ژمارا دلۆپێن پێدڤی تۆمار بکە هەتا رەنگێ گیراوەی دبۆریا تاقیکرنێدا دهێتە گوهارتن. پاشی هەمان ژمارا دلۆپێن گیراوێ سولفاتێ مسی بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «نەنیاس 2» و «ئاڤ –2».

**.9** ئەو ئەنجامێن تو گەهشتییێ دخشتێ زانیاریاندا تۆمار بکە.

## تاقیکرنا 3

**10** کارتا پێڤەنیسیانێ «زەیتا رووەکی–3» دانە سەر بۆریەکا تاقیکرنێ یا پاقژ، وکارتا پێڤەنیسیانێ «نەنیاس –3» دانە سەر بۆریەکا دییا تاقیکرنێ «یا دووێ»، وکارتا پێڤەنیسیانێ «ئاڤ –3» دانە سەر بۆریا تاقیکرنێ یا سێیێ. ب هاریکاریا مژۆکەکا دلۆپێنەر 5 دلۆپێن زەیتا رووەکی بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «زەیتا رووەکی–3». و ب هاریکاریا مژۆکەکا دلۆپێنەرا دووێ، 5 دلۆپێن گیراوێن نەنیاس بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «نەنیاس –3». و ب رێیا بکارئینانا مژۆکەکا دلۆپێنەرا سێیێ، 5 دلۆپێن ئاڤێ بکە سەر بۆریا تاقیکرنێ «ئاڤ –3».

**.11** **هشیاربە! گیراوێ سوودان III دێ جلكێن تە وپیستێ پیسكەت. هەر پیچا ژێ دژیت ئێكسەر پاقژ بكە.** گیراوێ سوودان III دهەمان وێ ژوورێڤە بكارنەئینە یا ئاگر لێ دهێتە بكارئینان. ب هاریكاریا مژۆكەكا دلۆپێنەرا پاقژ 3 دلۆپێن گیراوێن سودان III بكە سەر هەر بۆرییەكا تاقیكرنێ. و ب هاریكاریا تێكەلكەرەكێ پاقژ پێكهاتێن هەر بۆرییەكا تاقیكرنێ تێكەلبكە.

**.12** وان ئەنجامێن تە ب دەستخۆڤەئینایین دخشتێ زانیاریاندا بنڤێسە.

**.13** بەری تو ژتاقیگەهێ ب دەركەڤی ئامیرێن خۆ پاقژ بكە ودەستێن خۆ بشۆ.

## شلۆڤەكرن ودەرئەنجام

**.1** لدویڤ ئەنجامێن تە دخشتێ زانیاریاندا نڤێسایین، ماددێ خۆراكی، یان ماددێن خۆراكی دگیراوێ نەنیاسدا دەستنیشان بكە.

**.2** ماددێن خۆراكییێن هاتینە بكارئینان دڤێ چالاكییێدا چنە؟

## ڤەكۆلینەكا زێدەتر

كیژ گەردێن مەزن لدویڤ ڤەكۆلینا نەهاتە كرن ب رێیا ڤان تاقیكرنان دتاقیگەهێڤە؟ ئەگەرەكی بێژە بۆ ئەنجامدانا تاقیكرنەكێ سەبارەت وان.

داهاتێن فێرکاریێ

پرۆگرامێ تاقیگەهێ

چالاکیێن کریاریێن بەندان

ناڤ ______________

بەروار ______________ پۆل ______________

# بەندێ 3

## بەراوردیکرنا خانێن گیانەوەر ورووەکان

چالاکیا بنەڕەتی

### دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- پشکنینێ دکەت ڕوویێن وەکهەڤیێ وجوداهیێ دناڤبەرا پێکهاتنا خانێن گیانەوەر وپێکهاتنا خانێن ڕووەکاندا دکەت.

### شارەزایی

- پۆلێنکرن
- تێبینیکرن
- دانانا مگرتیەکێ

### مادده

- بەرکۆشکێ تاقیگەهێ
- بەرچاڤکێن پاراستنێ
- هویربینا ڕووناهیێ یا ئاوێته
- بگر
- سلایدێن هویربینی یێن شووشەی وسلایدێن داپۆشینێ (کەڤەر).
- شووشەکێ گیراوێ یۆدی دلۆپێنەر هەبیت.
- سلایدێن ڕووکەشە خانێن مرۆڤی یێن ئامادە.
- لقێن ڕووەکێ ئیلۆدیا Elodea (ڕووەکەکا ئاڤی یە).
- سلایدێن ئامادەیێن سێ نموونێن نەنیاس.

### پاشینە

**1.** دەمێ تو دڤێ چالاکیێدا هویربینەکا ڕووناهیێ یا ئاوێتە بکاردئینی، بۆ ئێکەم جار دێ تێبینیا سلایدەکێ ئامادەکری کەی ڕووکەشە خانێن مرۆڤی بێ لسەر، یێ ژوی پیستی هاتینە وەرگرتن ئەوێ دەڤی ناڤپۆشدکەت، پاشی تو بخۆ دێ سلایدەکی ئامادەکەی بەلگێ ڕووەکێ ئیلۆدیایا دیار دوێنێ لاپەرێ لدویڤدا بخۆڤە بگریت.



**2.** لدویف تێبینیێن تە لسەر ڕووکەشە خانێن مرۆڤی وخانێن بەلگێن ڕووەکێ ئیلۆدیۆیێ دێ داخاز ژتە هێتەکرن سێ سلایدان پۆلینبکەی خانێن نەنیاس بخۆڤە بگریت:
ئەرێ ئەو خانێن گیانەوەرینە یان خانێن ڕووەکینە؟

**3.** بەری تو تێبینیا هەر تشتەکی ژخانان بکەی، وان تایبەتمەندیێن پێکهاتنێ بهژمێرە یێن خانێن گیانەوەری جودا دکەن ژخانێن ڕووەکی.

بجهێنان

## بەشێ أ– خانێن گيانەوەری

1.  **هشياربە! سلايدێن هويربينێ يێن شووشەی ب چاڤدێريڤە بگرە. شووشێ شكەستی پاڤێژە دناڤ ئامانەكێ جودا دا كو مامۆستايێ تە دێ دەستنيشانكەت.**

2.  **هشياربە! ئاميرێن كارەبێ بكارنەئينە هەكە دەستێ تەيێ تەر بيت يان يێ نێزيكی ئاڤێ بيت.**

3. ب هاريكاريا پلا مەزنكرنێ يا بچووك بنێرە سلايدێ ڕووكەشە خانێن ئامادە. دراپۆڕتا خۆ يا تاقيگەهيدا وێنێ دوو يان سێ خانان بكێشە هەر وەكو ديار دبن ل پلا مەزنكرنێ يا بچووك، خانێن ژێكجودا (ژێكڤەبووی) ژێك دوو دەستنيشانبكە ودانە نيڤا جهێ ديتنێ. ب هاريكاريا پلا مەزنكرنێ يا مەزن بنێرە خانان. بەربەستی كۆنترۆلبكە داكو ڕووناهيێ كێمبكەی، وڕوونكرنەكا زێدەتر بدەستخۆڤەبينی.

4. دراپۆڕتا خۆيا تاقيگەهيدا دوو خانان يان سێيان وێنە بكە، هەروەكو لبن پلا مەزنكرنێ يا مەزن ديار دكەن. دئێكێ ژڤان خاناندا پەردا خانێ وسايتۆپلازمی وناڤكە بەرگی ديار بكە. وناڤێن وان لسەر وێنەی بنڤێسە.

## بەشێ ب– خانێن ڕووەكی

5. ب هاريكاريا بگری ب چاڤدێريڤە بەلگەكێ بچووك ژبلندترين چەقێ ئيلۆديۆيێ ڤەكە. بەلگی هەميێ دانە ناڤ دلۆپەكا ئاڤێ لسەر سلايدی. بەلگی ب سلايدێ داپۆشينێ (كەڤری) ی داپۆشە.

6. ب هاريكاريا پلا مەزنكرنێ يا بچووك بنێرە بەلگی. بەشێ ژدەرڤەيێ خانێن بەلگی ديوارێ خانێيە. وئەندامۆچكێن كەسكێن مەزن دخاناندا كەسكە پلاستيدن. دراپۆڕتا خۆدا هندەك ژڤان خانان وێنە بكە.

7. خانەكێ دەستنيشانبكە دشياندابيت ب ڕوونی بهێتە ديتن، وسلايدی ب لڤينە هەتا ئەو خانە دكەڤيتە نيڤا جهێ ديتنێ. ب هاريكاريا پلا مەزنكرنێ يا مەزن ل ڤێ خانێ بنێرە، وڕێكخەرێ بچووك بكاربينە هەتا خانە باش ديار دكەت.



**8.** ل خانەیەكا مەزنا ئیلۆدیایێ بگەریێ، دێ هاریكاریا تە كەت بۆ دیتنا دیوار وكەسكە پلاستیدێن وێ ب ڕوون وئاشكرایی. دراپۆرتا خۆیا تاقیگەهیدا وێنە بكە. دیوارێ خانێ و ب كێماسی كەسكە پلاستیدەكێ دیار بكە وناڤێ وان لسەر وێنەی بنڤێسە.

**9.** دهندەك خاناندا چێدبیت كەسكە پلاستید ب لڤلڤن. هەكە تە چ لڤین نەدیتن سلایدی ددەستێ خۆدا گەرمبكە یان بۆ ماوێ خولەكەكێ یان دووان ڕووناهیەكا بهێز بێخە سەر. پشتی هینگێ ب هاریكاریا پلا مەزنكرنێ یا مەزن بۆ جارا دووێ لێبنێرە، وچاڤدێریا لڤینا پێكهاتێن خانێ بكە. ڤێ لڤینێ دبێژنێ لڤینا سایتۆپلازمی Cytoplasmic streaming.

**10.** چونكی پەردا خانێ یا بەرەڤ دیوارێ خانێ یا پەستایە، چێدبیت تو نەبینی، وچێدبیت زێدەهیا كەسكە پلاستیدان دیسان ئەندامۆچكێن دی دخانێدا بەرزەكەن. ب ڕێیا ئامادەكرنا سلایدەكێ تەرێ بۆیاغكریێ ئیلۆدیایێ تو دشێی پەردا خانێ وبۆشاییا وناڤكێ وناڤكوكێ ڕوونتر ببینی.

**11.** بەركۆشكێ تاقیگەهێ بكە بەرخۆ وبەرچاڤكێن پاراستنێ بكە بەر چاڤێن خۆ. سلایدەكێ تەرێ ئیلۆدیۆیێ ئامادە بكە هەر وەكو دپێنگاڤا (5) دا تە ئەنجامدای، ئاڤێ بگوهۆڕە ب گیراوێ یۆدی. بهێلە بلا گیراوێ یۆدی دناڤ بەلگیدا بەلاڤ ببیت.

**12.** ب هاریكاریا پلا مەزنكرنێ یا بچووك تێبینیا خانێن بۆیاغكری بكە، پاشی یا مەزن. دراپۆرتا خۆیا تاقیگەهیدا خانەكا ئیلۆدیایێ یا بۆیاغكری وێنە بكە. بۆشاییا (ڤاكیول) نیڤەكێ وناڤكێ وناڤكوكێ وكەسكە پلاستیدا ودیوارێ خانێ وپەردا خانێ دیار بكە وناڤێ وان دانە سەر هەكە دروونبن.

## بەشێ ج– دبێژنێ خانێن نەنیاس

**13.** خشتەكێ دانە وەكو وی یێ ل بنێ لاپەری، تشتێ تو دنموونێن نەنیاسدا تێبینی بكەی تۆمار بكە.

**14.** سێ سلایدێن ئامادە یێن سێ نموونێن نەنیاس ژمامۆستایێ خۆ وەربگرە.

**15.** ب هاریكاریا پلا مەزنكرنێ یا بچووك تێبینیا هەر نموونەكێ بكە، پاشی ب پلا مەزن. دخشتێ زانیاریاندا ئەو هێمایا تە دایە هەر نموونەكا نەنیاس تۆمار بكە، و وەكو ڕووەك یان گیانەوەر پۆلێنبكە، و وان ئەگەرێن تو پالدای بۆ ڤێ پولێنكرنێ تۆمار بكە.

**16.** ئامیرێن بكارئینای پاقژ بكە، وبەری تو تاقیگەهێ بجە دهێلی دەستێن خۆ بشۆ.

| پۆلێنكرنا نموونێن نەنیاس | | |
|---|---|---|
| نموونا نەنیاس (ژمارا هێمایێ) | پۆلێنكرن (ڕووەك یان گیانەوەر) | ئەگەرێن پۆلێنكرنێ |
| | | |
| | | |
| | | |

## شلۆڤەکرن ودەرئەنجام

1. لدویف تێبینیێن خۆ، دڤێ چالاکیێدا، لیستەکێ ب ژمارا ڕوویێن وەکهەڤیێ دوی پێکهاتا هەیدا دناڤبەرا خانێن گیانەوەری وخانێن ڕوەکیدا دانە، ولیستەکا دی ب ژمارا ڕوویێن جوداهییێ دناڤبەرا واندا.
2. ب هزرا تە، فرمانێ لڤینا سایتۆپلازمی دخانا ڕووەکیدا چییە؟ گیراویێ یۆدی دبیتە ئەگەرێ ڕاوەستاندنا لڤینا سایتۆپلازمی. ب هزرا تە بۆچی ئەڤە ڕوودەت؟
3. دبەندێ (3) دا تە کیژ ئەندامۆچکە خواندیە وتە دڤێ چالاکیێدا نەدیت؟ ئەگەرێ نە دیتنا وێ چییە؟

## ڤەکۆلینەکا زێدەتر

بزڤڕە بۆ ژێدەرێن پەرتووکخانەیی بۆ دیتنا وان وێنێن هویربینیێن ئەلکترۆنییێن پێکهاتێن خانێ یێن تو نەشیایی ب هاریکاریا هویربینا ڕووناهییێ یا ئاوێتە ببینی.

داهاتێن فێرکاریێ
پرۆگرامێ تاقیگەهێ
چالاکیێن کریارییێن بەندان

ناڤ ________________

بەروار ____________ پۆل ____________

# بەندێ 4
(چالاکیا بنەڕەتی)

# تێبینیکرنا دابەشبوونا یەکسان دخانێن ڕووەکاندا

## دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- پشکنینا دابەشبوونا خانێن گۆپیتکا رەها پیڤازێ دکەت.
- قۆناغا وێ دابەشبوونا یەکسان **دەستنیشاندکەت** یا خانێن جودایێن گۆپیتکا ڕەها پیڤازێ پێداچن.
- درێژیا ڕێژەییا وێ ماوێ دەمی **دەستنیشاندکەت** یێ کو هەر قۆناغەك دبوورینیت (پێدادچیت) ددابەشبوونا یەکساندا دخانێن گۆپیتکا ڕەها پیڤازێدا.

## شارەزایی

- تێبینی
- پۆلێنکرن
- کۆمکرنا زانیاریان (داتایان)
- رێکخستن
- شلۆڤەکرنا پێزانینان (داتایان)
- هژمار

## مادده

- هویربینا ڕووناهیێ یا ئاوێتە
- سلایدێ هویربینێ یێ ئامادەیێ درێژە برگەیەکا گۆپیتکا ڕەها پیڤازێ Allium.

## پاشینه

1. دابەشبوونا یەکسان ژچوار قۆناغان پێکدهێت: قۆناغا بەرایی وقۆناغا کەمەرەیی وقۆناغا ژێکجودابوویێ وقۆناغا دویماهیێ.
2. نیوانە قۆناغ ناهێتە هژمارتن ژدابەشبوونا یەکسان.
3. تایبەتمەندیێن بهێنە دیتن بێژە یێن هەر قۆناغەکێ ژقۆناغێن دابەشبوونا یەکسان.
4. جهێن گەشەکرنێ یێن هەین دگەلەك ڕووەکاندا دبێژنێ شانێن دروستکەر دگۆپیتکێن گەشەکریدا، دابەشبوونا یەکسان بەردەوام تێدا ڕوودەت. شانێن دروستکەر یێ دگۆپیتکێن ڕەه وقەد وچقاندا هەین.

## بجهئینان

## بەشێ أ– دەستنیشانكرنا قۆناغێن دابەشبوونا یەكسان

**1.** ل وێنێ خوارێ بنێرە، ئەوژی درێژە برگەیەكێ گۆپیتكا ڕەها پیڤازێ دیاردكەت. دڤی وێنەیدا جهێ شانا دروستكەر ببینە. وەهەر وەكو تو دبینی، ئەڤ شانەیە ئێكسەر دكەڤیتە پشت كولاڤێ Root cap.

گۆپیتكا ڕەها پیڤازێ




**2.** هشیاری: ئێوانە قۆناغ ناهێتە هژمارتن ژدابەشبوونا یەكسان. پلا مەزنكرنێ یا بچووك دهویربینێدا بكاربینە دەمێ گۆپیتكا گەشەكری ددانیە دچەقێ دیتنا هویربینێ ورێكخستنا تیشكوییدا.

**3.** ب چاڤدێری پشكنینا شانا دروستكەر بكە. نموونەكێ ب هەلبژێرە تێزیكی 50 خانان. ل كۆمەڵەكا خانان بگەرێ هەر وەكو چالاك دیار دبوون دكریارا دابەشبوونێدا دەمێ ئەڤ سلایدە هاتیە ئامادەكرن. خانە دێ ب شێوێ پۆلان دیاربن، ئەوژی ل دویڤچوونا وان دێ ب ساناهی كەت. ئەو تەنێن بۆیاغەكا تاری هەی ناڤكە.

**4.** خشتەكێ زانیاریان ئامادە بكە وەكو خشتێ (أ) دراپۆرتا خۆیا تاقیگەهیدا.

**5.** قۆناغا دابەشبوونا یەكسانا هەر خانەیەكێ دنموونا خۆدا دەستنیشانبكە. نیشانەكێ دستوونا «ژمارا هژمارتنێ» دا دانە ب ڕەخ قۆناغا گۆنجایڤە.

**خشتێ (أ) ماوێ دەمێ ڕێژەییێ هەر قۆناغەكێ ژدابەشبوونا یەكسان**

| قۆناغا دابەشبوونا یەكسان | ژمارا هژمارتنێ | ژمارە | ڕێژا سەدی | دەم (خولەك) |
|---|---|---|---|---|
| قۆناغا بەرایی | | | | |
| قۆناغا كەمەرەیی | | | | |
| قۆناغا ژێكجودابوونێ | | | | |
| قۆناغا دویماهییێ | | | | |

## بەشێ ب– هژمارتنا ماوێ دەمێ ڕێژەییێ هەر قۆناغەكێ

**6.** پشتی هەر خانەیەك دنموونا تەدا هاتیە پۆلینكرن، وژمارا هژمارتیا هەر قۆناغەكێ هاتیە كۆمكرن ژماران دستوونا «ژمارە» دا تۆمار بكە. دكیژك قۆناغا دابەشبوونا یەكساندا ژمارا خانان پتر بوون؟ ودكیژك قۆناغێدا ژمارا خانان كێمتر بوون؟

**7.** ڕێژا سەدییا خانێن هەر قۆناغەكێ هژمار بكە. ژمارا خانان دقۆناغەكا دیاركریدا دابەشبكە لسەر كۆییێ ژمارا خانان دنموونا خۆدا، پاشی ئەنجامی لێكبدە ب %100. ڕێژان بكە دستوونا «ڕێژا سەدی» دا.

**8.** ڕێژا سەدییا خانێن هەر قۆناغەكێ پیڤانا درێژیا ماوێ وی دەمییە یێ هەر قۆناغەك ڤەدكێشیت. بۆ نموونە، ئەگەر ڕێژا خانان %25 بیت دقۆناغا بەراییدا، ماوێ وی دەمێ قۆناغا بەرایی ڤەدكێشیت دێ %25 بیت ژهەمی ماوێ وی دەمی یێ دابەشبوونا یەكسانا خانێ ڤەدكێشیت.

دابەشبوونا یەكسان دخانێن پیڤازێدا نێزیكی 80 خولەكان ڤەدكێشیت. دەمێ دروستێ هەر قۆناغەكێ هژمار بكە لدویڤ ڤان پێزانینان ولدویڤ وێ ڕێژا سەدی یا نۆكە تە دەستنیشانكری.

$$\text{دەمێ قۆناغێ (خولەك)} = \frac{\text{ڕێژا سەدی}}{100} \times 80 \ \text{خولەك}$$

**9.** دەمێ دروستێ هەر قۆناغەكێ دخشتێ زانیارییێن تایبەت ب تەڤە بینە خوار (بنڤێسە).

**10.** خشتەكێ دییێ زانیاریان ئامادە بكە وەكو وی خشتێ (ب) یێ خوارێ. ژمارا هەر قۆناغەكا دابەشبوونا یەكسانا تاكێن پۆلا خۆ كۆمبكە وپاشی تۆمار بكە. ڕێژا سەدی وزانیارییێن پەیوەندی ب دەمێڤە هەین بنڤێسە. ب بكارئینانا وان زانیاریان یێن تاكێن پۆلا تە هەمیان كۆمكرین.

**11.** بەری تو تاقیگەهێ بجە بهێلی ئامیرێن خۆ پاقژ بكە.

**خشتێ (ب) ئەو زانیارییێن ژهەموو تاكێن پۆلێ هاتینە كۆمكرن**

| قۆناغا دابەشبوونا یەكسان | هژمار | ڕێژا سەدی | دەم (خولەك) |
|---|---|---|---|
| قۆناغا بەرایی | | | |
| قۆناغا كەمەرەیی | | | |
| قۆناغا ژێكجودابوونێ | | | |
| قۆناغا دویماهیێ | | | |

## شلۆڤەكرن ودەرئەنجام

**1.** كرۆمۆسوم ب كیژ ڕەنگی هاتینە بۆیاغكرن؟

**2.** چەوان دێ شێی جوداهیێ كەی دناڤبەرا دەستپێكا قۆناغا ژێكجودابوونا دویماهیا وێدا؟

**3.** لدویڤ خشتێ زانیارییێن تە، كیژ قۆناغا دابەشبوونا یەكسان دەمەكێ درێژتر ڤەكێشایە؟ بۆچی چێدبیت ئەڤ قۆناغە پێدڤی ب دەمەكێ درێژتر هەبیت ژقۆناغێن دی ددابەشبوونا یەكساندا؟

4. لدویڤ خشتێ زانیارییێن تە، كیژ قۆناغ ژدابەشبوونا یەكسان دەمەكێ كێمتر ڤەكێشا؟

5. تو چەوان ئەنجامێن خۆ بەراورد دكەی دگەل ئەنجامێن تاكێن پۆلا خۆ هەمووان؟

6. دڤێ چالاكییێدا وەسا هاتە دانان كۆ رێژا سەدییا وی كۆیێ دەمی یێ هەر قۆناغەك ڤەدكێشیت یەكسانە ب رێژا سەدییا خانان دویێ قۆناغێدا دهەر دەمەكیدا. بۆچی چێدبیت ئەڤە یا دروست نەبیت سەبارەت وان نموونێن ژمارەكا زۆرا بچووكا خانان هەبن؟

## ڤەكۆلینەكا زێدەتر

1. لدویڤ تێكراییێ لەزاتیا دابەشبوونا یەكسانا جۆرەكێ دیاركریێ خانێن گیانەوەران، چەوان دێ شێیی وی دەمی دەستنیشانكەی یێ هەر قۆناغەكا دابەشبوونا یەكسان ڤەدكێشیت دوان خاناندا.

2. شانێن شێرپەنجەیی ژهندەك خانان پێكدهێن رادبن ب دابەشبوونەكا خانەییا بلەز وكۆنترۆل لسەر ناهێتە كرن. چەوان دێ شێیی رێكەكێ پێشئێخی بۆ دەستنیشانكرنا شانێن شێرپەنجەیی ب رێیا هژماركرنا ژمارا وان خانێن ب دابەشبوونا یەكسان رادبن؟

ناڤ ______________________

بەروار ____________ پۆل ____________

**1.أ**
چالاکیا زەنگینیکرنێ

# بەراوردیکرن دناڤبەرا زیندەوەران وتشتێن نەزیندیدا

**پاشینە**

ئەرێ سەخلەتێن هەڤپشك هەنە دناڤبەرا هەموو زیندەوەراندا؟ هەکە وەبیت، ئەو چ سەخلەتن؟ دڤێ چالاکیێدا دێ بزاڤێ کەی بەرسڤا ڤێ پرسیارێ دەی.

**دەرئەنجامێن فێرکاریێ**

دڤێ چالاکیێدا
- دێ تێبینیا زیندەوەران وتەتێن نەزیندی کەی، ودێ بەراوردیێ دناڤبەرا واندا کەی.

**مادده**

- سامپلێ یێ کارتا ب ناڤکرنێ
- هویربینێن (مایکرۆسکۆپێن) تەندار
- هویربینێن (مایکرۆسکۆپێن) ئاوێتە

**ئامادەکرن**

1. کۆمەلێن کاری یێن هەڤپشك پێکبینە، کۆمەلێ ژخوێندکاران.
2. خشتەکێ وەکو ڤی خشتێ خوارێ دانە.

| | نموونە | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سیفەت | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 |
| .1 | | | | | | | | | | |
| .2 | | | | | | | | | | |
| .3 | | | | | | | | | | |
| .4 | | | | | | | | | | |
| .5 | | | | | | | | | | |
| .6 | | | | | | | | | | |
| .7 | | | | | | | | | | |
| .8 | | | | | | | | | | |
| .9 | | | | | | | | | | |
| .10 | | | | | | | | | | |

3. دستوونا ئێکێ یا ڤی خشتەیدا (10) سەخلەتان یان کریاران بێژە تو دبینی گرێدانەك هەبیت ب زیندەوەرانڤە.

**بجهئینان**

4. ب چاڤدێریەکا باش تێبینیا سامپلی بکە. لدویڤ هەر رێنماییەکا تایبەت هەرە یێن کو چێدبیت مامۆستایێ تە دابنە تە لسەر دیتنا سامپلی.
5. نیشانا «×» دخشتێ زانیاریێن تایبەت ب تەڤە دانە دەڤ هەر سەخلەتەکێ تو دسامپلیدا تێبینی دکەی.
6. دەمێ تو تێبینیێن خۆ بجهدئینی هەر سەخلەتەکا دییا نوی بهێتە هزراتە دخشتێ خۆدا زێدە بکە.
7. پێنگاڤا 6- بۆ هەر سامپلەکی ژنموونان دووبارە بکە.

## شلۆڤەکرن

1. **کورتکرنا زانیاریان**: کیژ سامپلێ زیندەوەرن؟ دمرینە؟ تشتێن نە زیندینە؟

2. **بەراوردیکرن دناڤبەرا کۆمەلاندا**: ئەو چ سەخلەتێن هەڤپشکن دناڤبەرا زیندەوەراندا؟

3. **بەراوردیکرن دناڤبەرا کۆمەلاندا**: ئەو چ سەخلەتێن هەڤپشکن دناڤبەرا تشتێن نەزیندیدا؟

4. **رێکێن هەلسەنگاندنێ**: بۆچی یا ب زەحمەتە تێبینیا هەموو سیفەتێن هەڤپشك بهێتە کرن دناڤبەرا زیندەوەراندا؟

ناڤ ____________

بەروار ________ پۆل ________

# 2.أ چالاكیا زەنگینیكرنێ

# چێكرنا نموونێن خانان: ڕووبەرێ ڕووی لدویڤ قەبارەی

## پاشینە

ئەرێ سنورەك بۆ گەشەكرنا زیندەوەران دقەبارەیدا هەیە؟ هندەك مرۆڤ ددرێژن، لێ ناگەهنە درێژیا داران. هندەك مێرووێن مەزنێن هەین، لێ ناگەهنە وی قەبارەی یێ تو دشێی دبینی دفلمێن زانستیێن ئاشۆپیدا. بۆچی؟ ئەگەرەك ژێ گەشەكرنا قەبارێ نەگونجایە دگەل زێدەبوونێ دردێژییدا. هەكە بلندیا فیلی دووجا هند لێهات، دێ بارستەیا وی هەشت جاران ژبارستەیا ویا بنەڕەتی پتر لێهێت. فیل نەشێت ژوی قەبارەی مەزتر لێبێهێت، چونكی پێن وی نەشێن ژڤی بارستەی زێدەتر ب هەلگرن.

دڤێ چالاكیێدا، دێ پشكنینا ڕێژێن ڕووبەرێ ڕووی كەی بۆ قەبارەی لدویڤ پیڤەرەكێ بچووك، ب بكارئینانا هندەك نموونێن دەستكردێن خانان. ودێ وان زانیاریان بكارئینی یێن هاتینە كۆمكرن دا بگەهیتە هندەك دەرئەنجامێن پەیوەندی ب هۆكاریڤە هەی یێ وەدكەت ئەڤ ڕێژە سنورەكی بۆ پیڤانا خانێ بدانیت.

## دەرئەنجامێن فێركاریێ

دڤێ چالاكیێدا

- نموونێن خانێن جۆراوجۆر دێ دروستكەی و، دێ شلۆڤەكەی.
- دێ قەبارەی پیڤی وڕووبەرێ ڕوویی دێ هژماركەی.
- ڕێژێن ڕووبەرێ ڕووی بۆ قەبارەی دێ هژماركەی.
- دێ دەرئەنجامان دروستكەی لسەر سنورێ پیڤانێ، ب ڕێیا بكارئینانا زانیارێن تایبەت ب تەڤە.

## مادە

- پێبڕك (مەقەس)
- وێنەكێ پارچە پارچە لسەر كاغەزەكی، بهێتە بكارئینان بۆ دروستكرنا نموونا خانەیەكێ
- تولەكێ (لەوحەكێ) كارتۆنی
- ئامێرێ بژمێرە
- ڕاستەكێ ژمارەدار
- خیز
- كوڤك
- بۆرپەكا پلەدارا مەزن
- ئامیرەكێ بژمێرێ (هەلبژێری)

## ئامادەكرن

1. گرۆپێن كاری یێن هەڤپشك پێكبینە، گرۆپ ژخوێندكاران. سێ وێنێن پارچە پارچە لسەر كاغەزێ دروستبكە بۆ چێكرنا نموونێن خانان، وهەر ئێكی ڤەچەمینە بۆ ب دەستڤەئینانا شێوەكێ سێ لایی. پێدڤیە دوورێن خانێ دخشتێ دیاركریدا دپێنگاڤا (2) یا خوارێدا تۆمار بكەی. شریتا پێڤەنیسیانێ بكاربینە، وەكی ژتە هاتیە داخازكرن، ب ڕەنگەكێ شێوە جێگیر وپێكڤەمای بمینیت.

## بجهئینان

2. ب بكارئینانا ڕاستێ ژمارەدار، درێژیێ وپانیێ وبلنداهیێ، دهەر نموونەیەكێدا بپیڤە. دووریان دخشتەكێ وەكو ڤی خشتێ دیار دبند بنڤێسە.

| خانە | دووری (cm) | ڕووبەرێ ڕوویی $(cm^2)$ | قەبارە $(cm^3)$ | ڕێژا ڕووبەرێ ڕووی بۆ قەبارەی |
|---|---|---|---|---|
| أ | | | | |
| ب | | | | |
| ج | | | | |

2 cm
2 cm
2 cm
2 cm
2 cm
2 cm

3. هەر نموونەکی ب خیزی پر بکە. ب هاریکاریا راستەی ڕوویێ خیزیێ ب سەرەڤە یێ نموونێ ڕاستبکە.

4. قەبارێ خیزی دهەر نموونەکێدا بینەدەر. تو دشێی ڤی تشتی ب دوو ڕێکان بجهبینی.

أ. برا خیزی دهەر نموونەکێدا بینەدەر، ب هاریکاریا بۆرێکا پلەدار. خیزی ب هاریکاریا کۆڤکێ بکە بۆریا پلەدار یان بکە کۆپێ پیڤانێ. 1 ملیلیتر = 1 سم$^3$ ( $1cm^3$ ).

ب. ب بکارئینانا هاوکێشا دیار دپێنگاڤا 2 دا ئەوا دشلۆڤەکرنێدا هاتی قەبارەی بپیڤە.

## شلۆڤەکرن

1. **شلۆڤەکرنا نموونان** خشتێ زانیاریان بکاربینە ب هژمارکرنا ڕووبەر وقەبارێ هەر نموونەکێ. بلا ڕووبەرێ ڕوویێ گشتیێ هەموو نموونێ هژماربکەی، ڕووبەرێ هەر لایەکی بینەدەر (درێژی × پانی)، پاشی ژمارا پەیدابووی دێ لێکدەی دگەل ژمارە 6 . ڤێ دیارکرنێ دخشتەیدا بنڤێسە. بۆچی تو پێدڤی ب کریارا لێکدانێ دگەل ژمارە 6 ؟

---

---

2. **شلۆڤەکرنا نموونان** قەبارێ خیزی بینەدەر ب بکارئینانا هاوکێشا خوارێ:

قەبارە = درێژی × پانی × بلندهی

قەبارێ هەر نموونەکێ دخشتێ خۆدا تۆمار بکە.

3. **شلۆڤەکرنا نموونان** ڕێژا ڕووبەرێ ڕووی بۆ قەبارەی یێ هەموو نموونێ بینەدەر، ب بکارئینانا ڤێ هاوکێشێ: =

$$ڕێژە = \frac{ڕووبەرێ ڕووی}{قەبارە}$$

ئەنجامی دخشتێ خۆدا تۆمار بکە.

4. **بەراوردکرنا نموونان وژێکجوداکرنا وان** کیژ نموونە ب مەزنترین ڕووبەرێ ڕووی دهێتە وەسفکرن؟

---

کیژ نموونە ب مەزنترین قەبارە دهێتە وەسفکرن؟

---

کیژ نموونە ب مەزنترین ڕێژە دهێتە وەسفکرن؟

---

5. **پێشبینی** بۆ پاراستنا ژیانێ، پێدڤیە ماددە بشێن بچنە دناڤ خانێدا وژێ دەرکەڤن ژی. ئەو چ سەخلەتا چاڤەڕێکریە یا ڕووبەرێ ڕوویێ مەزن هەی؟

---

لایێ نەرێنیێ قەبارێ مەزن چیە؟

---

---

داهاتێن فێرکاریێ

پرۆگرامێ تاقیگەهێ

چالاکیێن تاقیگەهیێن بلەز

ناڤ ___________

بەروار ___________ پۆل ___________

# 3.أ چالاکیا دەستپێکێ

# بکارئینانا رێکا وەرگرتنا نموونان ب هەرەمەکی

## پاشینە

زانا نەشێن هەموو زیندەوەرەکی دکۆمەڵەکا زیندەییدا هژمار بکەن. ئێك ژرێکێن خەملاندنا قەبارێ زیندەیی کۆمکرنا زانیاریانە ب رێیا وەرگرتنا نموونان ب شێوەکێ هەرەمەکی. دڤێ چالاکیێدا، دێ ل چەوانیا بەراوردیکرنا وان زانیاریان گەریێ یێن ب رێیا وەرگرتنا نموونان ب هەرەمەکی وزانیارێن پەیدابووی ژهژمارتنا دروست ب دەستڤەدهێن. وەرگرتنا نموونان بکاردئینن درێژبەندیکرنا گەشا کۆمەڵەکا زیندەیی دسیستەمەکێ ژینگەهیێ دەستنیشانکریدا، ئەوژی ئێك ژوان رێکێن زۆرە یێن زانا بکاردئینن دکۆمکرنا زانیاریاندا دڤەکۆلینا سیستەمێن ژینگەهیدا.

## دەرئەنجامێن فێرکاریێ

دڤێ چالاکیێدا دێ ب ڤی تشتی رابی:

- **خەملاندنا** ژمارا رووەکێن گول بەرۆژێ ب رێیا وەرگرتنا نموونان.
- **هژمارتنا** رووەکێن ل دۆر رۆژێ دزڤرن (گول بەرۆژان) دزەڤیەکێدا.
- **دێ بەراوردیێ** کەی دناڤبەرا وان زانیاریاندا یێن هاتینە کۆمکرن.
- دێ رێژا سەدیا خەلەتیێ **هژمێری**.

## ماددە

- کاغەزەکا نەهێلدار
- راستە
- پێنڤێسێ رساسی
- پێبڕك
- کوپێن پلاستیکی (2)

## ئامادەکرن

**1.** کاغەزەکێ ببرە وبکە 20 پارچە، ب پیڤانێن 4 cm x 4 cm ب تێزیکی.

**2.** 10 پارچێن کاغەزان ژمارە بکە، ژ (1 هەتا 10) ێ. پارچێن کاغەزێ یێن ژمارەکری دانە دناڤ کۆپەکێدا.

| رێك | ناڤەندێ ژمارا رووەکان دهەمی کەرتێن تۆرێدا | ژمارا گشتیا رووەکان |
|---|---|---|
| نموونە | | |
| ژمارا دروست | | |

## بجهئینان

**3.** هەر ژپیتا (أ) هەتا (ي) لسەر پارچێن دیێن کاغەزێ ئەوێن ماین بنڤێسە، ودانە دناڤ کۆپەکێ دیدا.

**4.** بۆ نڤیسینا زانیاریێن خۆ خشتەکی وەکو ڤی خشتێ خوارێ دانە.

**5.** ئەو تۆرا دیار لڤێرە جهەکی ب پیڤانێن 10 mm بۆ هەر لایەکێ وی دنوێنیت. پیڤانا هەر کەرتەکی ژتۆرێ ئەڤەیە (1mm x 1mm) هەر بازنەکا رەش رووەکەکا گول بەرۆژێ دنوێنیت.



6. ب هەرەمەکی ژهەر کۆپەکی پارچەکا کاغەزێ بکێشە. لسەر هەر کاغەزەکا جودا یادا جووتەکێ نێن تە کێشاین ژمارە ویتەکێ بنڤیسە، پاشی کەرتێن وێ تۆرێ ببینە نێن دگەل ڤی جووتی دگونجن. ژمارا رووەکێن گول بەرۆژێ دڤی جووتیدا بژمێرە. ژمارا رووەکێن گول بەرۆژێ دوی کەرتێ تۆرێدا بژمێرە. ڤێ ژمارێ لسەر کاغەزەکا جودا بنڤێسە. هەر پارچەکا کاغەزێ بزڤرینە بۆ کۆپیێ وی.

7. پێنگاڤا 6 دووبارە تەمامبکە هەتا تو زانیارییێن 10 کەرتێن جودایێن تۆرێ ب دەستخوڤەدئینی. ئەڤ هەر 10 کەرتێن تۆرێ نموونێ دنوێنیت. کریارا کۆمکرنا زانیاریان ژنموونەکێ ب رێکەکا هەرەمەکی هاتبیتە هەلبژارتن ژدەڤەرەکا مەزنتر یان کۆمەڵەکا مەزنتر دبێژنێ کریارا وەرگرتنا نموونێ.

8. ژمارا گشتیا رووەکێن گول بەرۆژێ دنموونا هەر 10 کەرتاندا بینەدەر. ئەڤ کریارە خەملاندنەکێ پێکدئینیت ولسەر وەرگرتنا نموونان یا هاتیە دانان، بۆ ژمارەکا رووەکان دزەڤیەکێدا. ڤێ ژمارێ دابەشبکە لسەر 10 ێ بۆ دەستنیشانکرنا ناڤەندێ ژمارا رووەکێن گول بەرۆژێ دمەترەکا چوارگۆشەیا نموونێدا. ڤێ ژمارێ دخشتەیدا بنڤێسە.
ناڤەندێ ژمارا رووەکێن گول بەرۆژێ دمەترەکا چوارگۆشەدا لێکبدە دگەل 100 بۆ دیارکرنا ژمارا گشتیا رووەکان دزەڤیێدا. ڤێ ژمارێ دخشتێ خوٚدا بنڤێسە.

9. راب ب هژمارتنا دروستا هەموو رووەکێن گول بەرۆژێ ئەوێن دیارکری دزەڤیێدا. ڤێ ژمارێ دخشتێ خوٚدا بنڤێسە. ڤێ ژمارێ دابەشی 100 ێ بکە بۆ هژمارتنا ناڤەندێ ژمارا رووەکێن گول بەرۆژێ دمەترەکا چوارگۆشەدا. ڤێ زانیاریێ دخشتێ خوٚدا بنڤێسە.

## شلوٚڤەکرن

1. **بەراوردیکرنا زانیاریان** بەراوردییێ بکە دناڤبەرا ژمارا دروست و وان زانیاریان یێن تە نڤێسایین ئەوێن دزڤرنەڤە بۆ خەملاندنا تە ل دەمێ وەرگرتنا نموونێ ب هەرەمەکی.

2. **رێکێن شلوٚڤەکرنێ** رێکا پارچێن کاغەزێ بۆچی پشت ب هەلبژارتنا کەرتێن تۆرێڤە بەست؟

3. **رێکێن هەلسەنگاندنێ** ب خەملاندنا تە رێژا سەدییا خەلەتییێ چەندە؟ بۆ هژمارتنا رێژا سەدییا خەلەتییێ، جوداهییێ دناڤبەرا ژمارا دروست وژمارا خەملاندیدا بینەدەر. جوداهییێ لسەر ژمارا دروست دابەشبکە ودگەل 100 ێ لێکبدە.

$$\text{رێژا سەدیا خەلەتییێ} = \frac{\text{جوداهی}}{\text{ژمارا دروست}} \times 100$$

4. **بەلگەئینان** چەوان دێ شێی کریارێ دڤێ چالاکیێدا راست کەیەڤە بۆ کێمکرنا رێژا سەدییا خەلەتییێ ل دەڤ خوٚ؟

ناڤ ____________________

بەروار ____________ بەروار ____________

## 4.أ
چالاکیا زەنگینکرنێ

# گرێدان دناڤبەرا پێکهاتنا خانێ وفرمانێدا

**پاشینە**

خوین یا پێکهاتیە ژخانان، وپرتکێن خانان (پەرکێن خوینێ)، پلازما شل. دڤێ چالاکیێدا دێ دیارکەی چ پێکڤە گرێدانەك هەیە دناڤبەرا پێکهاتا خانێن دیارکریێن (دەستنیشانکری) خوینێ وئەو فرمانێ هەر ئێك ژوان بجە دئینیت.

**دەرئەنجامێن فێرکاریێ**

دڤێ چالاکیێدا

- دێ **تێبینیا** خانێن خوینێ کەی.
- **پێکهاتنا** خانێ وفرمانێ وێ دێ پێکڤە گرێدەی.

**مادە**

- سلایدەکێ ئامادەیێ خوینا مرۆڤی
- هویربینا (مایکرۆسکۆپا) ڕووناهیێ یا ئاوێتە

**ئامادەکرن**

**بجهئینان**

1. گرۆپێن کاری یێن هەڤپشك پێکبینە، گرۆپ ژخوێندکاران، بۆ تەمامکرنا ڤێ چالاکیێ. کاغەزا ژێکجودا بکاربینە بۆ دانانا خشتەیەکێ ئامادە بۆ نڤێسینا تێبینیێن خۆ.
2. ب هاریکاریا هێزا مەزنکرنێ یا هویربینیا بچووك بنێڕە سلایدێ ئامادەیێ خوینا مرۆڤی. دانانا سلایدی ب گوهۆڕە وبەردەوام بە ب لێنێرینێ.
3. هێزا مەزنکرنێ یا مەزنتر بکاربینە بۆ کۆنترۆلکرنا باشا دیارکرنا خانان. ژمارا ڤان خانێن ژهەمیا پتر دبێژنێ تەپکێن سۆرێن خوینێ. وێنەکێ تێروتەسەل دروستبکە ژمارەیەکا ڤان خانێن خوینێ دیار بکەت. وان بەشێن خانێ ئەوێن نە نیاسین بناڤبکە. ل دۆر قەبارە وشێوێن خانێن سۆر وژمارا وانا ڕێژەیی تێبینیێن خۆ بنڤێسە.
4. هێدی سلایدی لاببە هەتا تو خانەکێ یان پتران مەزنتر دبینی، دێ دیار بیت گەلەکا جیاوازە ژخانێن سۆرێن خوینێ. دبێژنە ڤان خانێن مەزن خانێن سپیێن خوینێ. وێنێ خانەیەکا سپیا خوینێ وێنەبکە. وان بەشێن خانێ یێن تو دزانی بناڤبکە. لدۆر قەبارەی وشێوێ خانێن سپیێن خوینێ وژمارا وانا یا ڕێژەیی تێبینیێن خۆ بنڤێسە.
5. ل شێوێ خالێن قەبارە زۆر بچووك ل پرتکێن خانان بگەریێ، ئەڤان دبێژنێ پەرکێن خوینێ. وێنەکێ چەند پەرکێن خوینێ وێنە بکە.

**ئەڤۆلەکرن**

1. **دەستنیشانکرنا پەیوەندیان** ڤەگۆهاستنا ئۆکسجینی بۆ بەشێن لەشی فرمانەکێ گرنگێ خوینێ پێکدئینیت. ئەو چ بەلگەیە دیار دکەت کو ئەڤ فرمانە ب شێوەکێ باشتر خانێن سۆرێن خوینێ ئەنجامدەن نەکو خانێن سپیێن خوینێ؟

____________________

____________________

____________________

2. **بەلگەپێدان** ئەو چ بەڵگەیە دیاردکەت کو تەپکێن سپییێن خوینێ بتنێ دشێن زۆربن.

3. **دەستنیشانکرنا پەیوەندیان** گرتنا زیندەوەرێن سەیر، وەکو بەکتریاییێ، وژناڤبرنا وێ فرمانەکێ دییێ خوینێیە. ئەو چ بەڵگەیە دیار دکەت تەپکێن سپییێن خوینێ پتر دگۆنجاینە ژتەپکێن سۆرێن خوینێ بۆ ڤی فرمانی؟

ناڤ ________________

بەروار ____________ پۆل ____________

# ب.1 چالاکیا بنەڕەتی

# پێکهاتیێن خانێ

## شارەزایی

- بکارئینانا هویربینا ئاوێتە.
- ئامادەکرنا سلایدێن هویربینی یێن نموونێن تەر.

## دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- ئەندامۆچکان دناڤ خانێن جودا دا دنیاسیت، وبەراوردیێ دکەت دناڤبەرا واندا.
- پێکهاتنا خانان ب فرمانێ وانڤە گرێددەت.

## ماددە (کەرەستە)

- بەرکۆشکێ تاقیگەهێ
- چاندیێ ئەمیبایێ ئامادە
- مژۆکا دلۆپێنەر
- سلایدێن شووشەی
- سلایدێن داپۆشینێ (کەڤەر)
- هویربینا ڕووناهییێ یا ئاوێتە
- بەلگێ ئیلۆدیایێ
- سلایدێن ئامادەیێن تۆڤێ بەقێ
- سلایدێن ئامادەیێن خوینا بەقێ
- سلایدێن ئامادەیێن پیستێ بەقێ

## ئارمانج

دڤی کارێ تاقیگەهیدا، دێ تێبینیا جۆرێن جودایێن خانان کەی، ودێ پێکهاتنا خانێ وفرمانێ وێ پێکڤە گرێدەی (پەیوەندی دناڤبەرا واندا).

## پاشینە

سایتۆپلازمێ خانا ناڤك ڕاستەقینە پێکدهێت ژشلەیەکێ وەکو جلیێ، وئەندامۆچکێن خانێ کو ئەوژی بەشێن خانێنە وفرمانێن دیارکری یێن هەین. مرۆڤ دشێت هندەك ئەندامۆچکان ب هاریکاریا هویربینا ڕووناهیێ یا ئاوێتە ببینیت. ئەو ناڤکا ئاسایی ل نێزیکی ناڤەڕاستا خانێ هەی سەنتەرێ کۆنترۆلکرنییە دخانێدا. کەسکە پلاستید کلۆرۆفیلێ تێدا هەی وکریارا ڕۆشنە پێکهاتنێ دخانێن ڕووەکی وقەوزاندا ئەنجامددەت. بوشایی مادداں وەکو ئاڤێ یان خۆراکی یان پاشەڕۆیان کۆمدکەن. ب هاریکاریا هویربینا ڕووناهیێ یا ئاوێتە مرۆڤ دشێت پێکهاتیێن خانێ یێن دی ببینیت ئەوژی ئەڤەنە: پەردا خانێ ودیوارێ خانێ. ئێك ژتێگەهێن بنەڕەتیێن زیندەزانییێ ئەوە کو پێکهاتن، یان ڕێزبەندیا بەشان، یا ب فرمانیڤە یان ب شێوازێ کارێ بەشانڤە گرێدایە. دشیاندایە لسەر ئاستێن ڕێکخستنا جودا وەکو شانە وئەندام وکۆئەندامان تێبینیا پەیوەندیێ بکەی دناڤبەرا پێکهاتن وفرمانیدا. خانە یەکا بنەڕەتیا پێکهاتن وفرمانێ هەموو زیندەوەرانە.

## بجهئینان

### بەشی 1 سایتۆپلازم وئەندامۆچکە

**1.** بەرکۆشکێ تاقیگەهێ بکە بەرخۆ. دلۆپەکا شللەی ژبنێ چاندیێ ئەمیبایێ وەرگرە، ودانە سەر سلایدەکێ هویربینی. پاشی ب سلایدێ داپۆشینێ داپۆشە.

**هشیاربە:** ماددێن شووشەی زوو دشکێن. دەمێ هەر شووشەك دشکیت یان هەر تووشبوونەکا بریندارییێ چێدبیت ێکسەر بێژە مامۆستایێ خۆ. نە ڕابە ب ڕاکرنا پارچێن شووشەی یان هەر ماددەکێ ڕشتی هەکە مامۆستایێ تە نەبێژیتە تە.

**2.** سلایدی دانە سەر ستێجا هویربینا ڕووناهیێ. حەستیا خالا نیڤەکێ ب هاریکاریا تەنە هاوێنا بچووك بجهبینە. ئەمیبایێ ببینە وتێبینیا سایتۆپلازمی بکە.

♦ سایتۆپلازم یێ چەوایە؟ سایتۆپلازم چەوان دلڤیت؟

**3.** بۆشاییێ دخانێدا ببینە. ئەڤ بۆشاییە پێكهاتەكە لسەر شێوێ پەقیشكێ. هاوێنی ب گوهۆڕە وبكە تەنە هاوێنا مەزن، وتێبینیا بۆشاییێ بكە. ئەمیبایێ وێنە بكە لبن سیبەرا هێزا مەزنكرنێ یا بچووك، وهێزا مەزنكرنێ یا مەزن دڤێ بۆشاییا خوارێدا. هێزا مەزنكرنێ لبن هەر وێنەكێ بنڤێسە. ئەو بەشێن خانێ یێن تە دیتن ناڤان دانە سەر.

♦ ئەرێ ئەمیبایێ ب كێماسی بۆشاییەك هەیە؟




**4.** بەلگەكێ ژگوپیتكا چقەكێ ئیلۆدیایێ وەربگرە. سلایدێ نموونەكا تەڕا بەلگی ئامادە بكە ولبن هێزا مەزنكرنێ یا بچووك تێبینینی بكە. كەسكە پلاستیدان ببینە وجهێ وان دەستنیشانبكە.

♦ دابەشبوونا (بەلاڤبوونا) كەسكە پلاستیدان دخانێدا تو چەوان وەسف دكەی؟

**5.** هێزا مەزنكرنێ ب گوهۆڕە وبكە هێزا مەزنكرنێ یا مەزن. وبۆ چەند خولكەكان ب هویری بنێرە خانەیەكێ، ب چاڤدێریكرنا لڤینا كەسكە پلاستیدان.

♦ هەر لڤینەكا كەسكە پلاستیدان وەسف بكە.

♦ لدویڤ هزرا تە، كەسكە پلاستید بۆچی دلڤلڤن؟

♦ بۆشاییەكێ ببینە. چەند بۆشاییان تو دبینی؟

**6.** دبۆشاییا خوارێدا خانەیەكا ئیلۆدیایێ لبن هێزا مەزنكرنێ یا بچووك وهێزا مەزنكرنێ یا مەزن وێنە بكە. هێزا مەزنكرنێ لبن هەر وێنەیەكی بنڤێسە. ئەو ئەندامۆچكێن تە دیتین بناڤبكە.



**.7** خشتێ خوارێ تەمامبكە دا بەراوردییێ بكەی دناڤبەرا خانێن ئەمیبا وئیلۆدیاییێدا. دەمێ پێكهاتەك هەبیت «بەلێ» بنڤێسە، ودەمێ نەبیت (نەخێر) بنڤێسە.

| پێكهاتن | ئەمیبا | ئیلۆدیا |
| --- | --- | --- |
| پەردا خانێ | | |
| دیوارێ خانێ | | |
| سایتۆپلازم | | |
| ناڤك | | |
| كەسكە پلاستد | | |
| بۆشایی | | |

## بەشێ 2 پێكهاتنا خانان وفرمانێ وان

**.8** سلایدەكێ ئامادەیێ تۆڤێ بەقێ وخوینا وێ وپیستێ وێ پەیدابكە. پشكنینا هەر سلایدەكی بكە، ئێكەم جار ب بكارئینانا تەنە هاوێنا بچووك پاشی یا مەزن.

♦ كیژ جۆرێ خانان ناڤك هەیە؟

---

**.9** دبۆشاییا خوارێدا، هەر خانەیەكێ چەوان تە لبن هێزا مەزنكرنێ یا بچووك ومەزن دیتی وێنە بكە. هێزا مەزنكرنێ ب ڕەخ هەر پۆلەكا وێنانڤە بنڤێسە.




**.10** لدویڤ ڕێنماییێن مامۆستایێ خۆ وان ماددێن تە هەین پاقژە.

**.11** جهێ كارێ خۆ پاقژ بكە وبەری تو ژتاقیگەهێ دەركەڤی دەستێن خۆ بشۆ.

## شلۆڤەكرن

**12.** بەراوردییێ بكە دناڤبەرا لڤینا سایتۆپلازمی دئەمیبایێ وئیلۆدیاییێدا. ئەرێ تو دبینی هەمان فرمان بجهدئینن دهەردوو زیندەوەراندا؟

______________________________________

______________________________________

**13.** مگرتیەكێ دانە بۆ ڕوونكرنا جوداهییێ، لسەر ئاستێ بۆشاییان، دناڤبەرا خانا ئیلۆدیاییێ وخانێن ئەمیباییێدا.

______________________________________

______________________________________

**14.** تە شێوێن هەرسێ جۆرێن خانێن بەقێ دیتن، بەراوردییێ بكە دناڤبەرا واندا.

______________________________________

______________________________________

**15.** ئەو چ پێكهاتێن هەڤپشكن دناڤبەرا ئەمیبایێ وئیلۆدیاییێدا؟ وئەو چ پێكهاتێن جیاوازن دناڤبەرا واندا؟

______________________________________

______________________________________

## دەرئەنجام

**16.** كیژ خانێن بەقێ دگۆنجن دگەل فرمانێ بەرگەكرنێ (داپۆشینێ) وناڤپۆشكرنێ؟ ئەو چ تایبەتمەندینە وەدكەن ئەو خانە ڤی فرمانی بجهبینن؟

______________________________________

______________________________________

**17.** كیژ خانێن بەقێ دگۆنجن دگەل ڤەگۆهاستنا ئۆكسجینی دبۆرێن خوینێڕا؟ ئەو چ تایبەتمەندینە وەدكەن ئەو خانە ڤی فرمانی بجهبینن؟

______________________________________

______________________________________

**18.** كیژ خانێن بەقێ دگۆنجن دگەل بەرەف هێكێ چوونێ وئێككگرتنێ دگەلدا؟ ئەو چ تایبەتمەندینە وەدكەن ئەو خانە ڤی فرمانی بجهبینن؟

______________________________________

______________________________________

## بەرفرەهەكرنا ئاسۆیێن هزركرنێ

**19.** نیگاركێشێن نوژدارییێ وێنێن دەستپێكێن شانێن گیانەوەری ددانن دا دپەرتووك ونیشاندەرێن (گۆڤار ورۆژنامە) زانستیدا بهێنە بكارئینان. ئەوژی ڕێكێن بینینێن فێركرنا تێگەهێن زانستی پێشدئێخن. ل شارەزایی وراهێنانێن پێدڤی بگەڕێ دا مرۆڤ ببیتە نیگاركێشەكێ نوژداری.

**20.** لەوحەكێ وێنەیی ئامادەبكە نموونێن وان پێكهاتێن هەین دهەر ئاستەكێ ڕێكخستنا لەشیدا دیار بكەت (خانە، شانە، ئەندام، كۆئەندام، زیندەوەر)، وهندەك نموونان بۆ شلۆڤەكرنێن چەوانیا ڕێزكرنا بەشێن وێ وپەیوەندیا وان ب فرمانێ وانڤە ڕوونبكەت.

داهاتیێن فێرکاریێ

پرۆگرامێ تاقیگەهێ
چالاکیێن پێشئێخستنا
شارەزاییێن لدویڤگەڕیانێ

ناڤ ____________

بەروار ____________ پۆل ____________

## 2.ب
چالاکیا زەنگینکرنێ

# دابەشبوونا یەکسان

**شارەزایی**

- قۆناغێن دابەشبوونا یەکسان دخانێن رووەك وخانێن گیانەوەراندا پێناسە دکەت.
- پێکهاتێن خانێ پێناسە دکەت.
- پێکهاتێن ب هویربینێ دهێنە دیتن وێنە دکەت.

**دەرئەنجامێن فێرکاریێ**

- وان خانان **دنیاسیت** یێن ب کریارا دابەشبوونا یەکسان ڕادبن.
- **بەراوردیێ** دکەت دناڤبەرا قۆناغێن دابەشبوونا یەکسان دخانێن ڕووەکاندا ودناڤبەرا قۆناغێن وێدا دخانێن گیانەوەراندا.

**مادده**

- سلایدێن ئامادەیێن گوپیتکا ڕەها پیڤازێ یان سیرێ (درێژە برگە).
- هویربینا ڕووناهیێ یا ئاوێتە.
- سلایدێن ئامادەیێن پلاستولایێ ماسیێ (برگە ب هەموو ئاراستێن جودا).

**ئارمانج**

دڤێ کارێ تاقیگەهیدا، دێ ب ڤەکۆڵینا دابەشبوونا یەکسان ڕابی ودێ بەراوردیێ کەی دناڤبەرا قۆناغێن وێدا دخانێن ڕووەك وگیانەوەراندا. هەروەسان دقۆناغێن جودایێن دابەشبوونا یەکساندا دێ خانان نیاسی.

**پاشینە**

هەموو خانە ب کریارا گەشە ودابەشبوونێ ڕادبن دبێژنێ زڤڕۆکا ژیانا خانێ. زڤڕۆکا ژیانا خانێ ژسێ قۆناغێن سەرەکی پێکدهێت: نێوانە قۆناغ، ودابەشبوونا یەکسانا ناڤکێ، ودابەشبوونا سایتۆپلازمی. دنێوانە قۆناغێدا، خانە گەشە دکەت، وناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجینی دێ دووهێندبیت. خانە پتریا ژیانا خۆ دنێوانە قۆناغێدا دبووڕینیت. قۆناغا ددویڤدا دابەشبوونا یەکسانە، یا کو تێدا ماددێن دووهێندبووی ژێکجودا دبن بۆ دوو ناڤکێن سەربەخۆ. **دابەشبونا یەکسان** هەموو ژچوار قۆناغان پێکدهێت ئەوژی ئەڤەنە: **قۆناغا بەرایی (ئامادەیی)، قۆناغا کەمەرەیی، قۆناغا ژێکجودابوونێ، قوناغا دویماهیێ.** دوو ناڤکێن وەکهەڤ ژدابەشبوونا یەکسان پەیدا دبن.

دابەشبوونا سایتۆپلازمی قۆناغا دویماهییە ژدابەشبوونا خانێ، وتێدا سایتۆپلازمێ خانێ ژلایێ وان خانێن نوی دروستدبن دابەشدبیت. تەمامبوونا زڤڕۆکا ژیانا خانێ دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا دوو خانێن نوی، یێن وەکهەڤ ژلایێ بۆماوەیڤە، ژدابەشبوونا دایکە خانەیەکێ دروستدبن.

**بجهئینان**

### بەشێ 1 دابەشبونا یەکسان دخانێن ڕووەکاندا

**1.** بنێرە سلایدەکێ ئامادەیێ درێژە برگەیەکێ گۆپیتکا ڕەها پیڤازێ یان سیرێ. هێزا مەزنکرنێ یا بچووك بکاربینە بۆ دەستنیشانکرنا جهێ وان خانان یێن ب شێوەکێ چالاك دابەشدبن، ل نێزیکی ڕەخێ ڕەهێ. دەمێ هێزا مەزنکرنێ یا مەزن بکاردئینی دا تاکە خانان دوی جهیدا پشکنین بکەی، خانەیەکێ ژهەر قۆناغەکێ ژقۆناغێن دابەشبوونا یەکسان ببینە، ب پشتبەستن ب وان سیفەتان ئەوێن دلیستێن قۆناغێن خوارێدا هاتین. دبۆشاییا ئامادەکریدا بۆ ڤێ چەندێ خانەیەکێ دوێ قۆناغێدا وێنە بکە، لدویڤ چەوانیا دیاربوونا وان دوی سلایدێ هویربینیێ تە هەی.

#### نێوانە قۆناغ

قۆناغا چالاکیا خانەیەکا دروستە (ساخلەمە). دڤێ قۆناغێدا مرۆڤ نەشێت تاکە کرۆمۆسۆمان ژێکجودا بکەت، ئەوژی ب شێوێ گۆمتلێن ڕەنگ تارێن هندەك ماددان دیار دبیت دبێژنێ کرۆماتین. ل دویماهیا ڤێ قۆناغێ دووهێندبوونا ناڤکە ترشێ کێم ئۆکسجینی یێ سەرب هەر کرۆمۆسۆمەکێڤە یێ ب داوی هاتی. ئاگەهداربە ناڤکێ ناڤکۆکەك یان دوو ناڤکۆکە یێن هەین ڕەنگێ وان یێ تاریە ودپرن ژکرۆماتینی.

## قۆناغا ئامادەیی

دڤێ قۆناغێدا کرۆماتین وەکو بارستەکێ دەزیێن ستوور دیاردبیت.
ئەڤ دەزیەنە وان کرۆمۆسۆمێن کۆپی بووی دنوینن یێن لێکئالیای
وکورت بووین. نۆکە هەر کرۆمۆسۆمەك ژجووتەکێ کرۆماتیدان
پێکدهێت، کو ئەوژی کۆپینە ژکرۆمۆسۆما بنەرەتی. کرۆماتید ئێك یا
ب یا دیڤە گرێدایە ب هاریکاریا پاچا ناڤەندی (سێنترومیر).
ل دویماهیکا قۆناغا ئامادەیی، پەردا ناڤکێ وناڤکۆکە ناهێنە دیتن،
لێ کرۆمۆسۆم وەکو جووتە کرۆماتیدان ل ناوچا نیڤەکا خانێ دی
دیاردبن وئاشکرابن.

## قۆناغا کەمەرەیی

دڤێ قۆناغێدا کرۆمۆسۆم ل هێلا کەمەرەییا خانێ دێ رێزبن.
وبارستەکێ دەزیان دێ دناڤبەرا هەردوو جەمسەرێن خانێ وبارستێ
کرۆمۆسۆماندا دروستبیت دبێژنێ تەشیلە. هەر ریشالێن تەشییێ
ژهەردوو جەمسەرێن خانێ دەردکەڤیت و ب کرۆمۆسۆمەکێڤە
(جووتەکێ کرۆماتیدان) دنیسییێت.

## قۆناغا ژێکجودابوونێ

دڤێ قۆناغێدا پارچا ناڤەندێ یا هەر جووتەکێ کرۆماتیدان
دابەشدبیت. کرۆماتید دهێنە ڤەگۆهاستن ئەوژی ب ڤێنا وان ب
درێژاهیا ریشالێن تەشییێ، بەرەڤ هەردوو جەمسەرێن خانێ.
کرۆماتیدەك ژهەر جووتەکی دێ بەرەڤ جەمسەرەکێ خانێ یێ
بەرامبەری ئێك چیت.

## قۆناغا دویماهیێ

دڤێ قۆناغێدا کرۆماتید (نۆکە دبێژنێ کرۆمۆسۆم) وەکو دوو بارستێن
سەربەخۆنە، هەر ئێك ل جەمسەرەکێ. پەردەیەکا نوی یا ناڤکێ ل
دۆر هەر بارستەکێ ژوان کرۆمۆسۆمان دێ دروستبیت یێن شێوێ
خویێ پێچا وپێچ بەرزە دکەت ودزڤرنەڤە بۆ شێوێ تۆرەکا کرۆماتینی
هەر وەکو مە دنێوانە قۆناغادا دیتین، وناڤك دێ دیار بنەڤە. سەبارەت
رووەکان، دیوارێن نوییێن خانێ دێ گەشەکەن داکو دوو خانێن
پەیدابوویێن نووییێن وەکهەڤ ژێکجودا بکەن.

♦ خانا چ شێوە هەنە؟

---

♦ کرۆمۆسۆم ب چ بۆیاغ رەنگ دبن؟

---

♦ ل دەمێ دابەشبوونا سایتۆپلازمی چ رووددەت؟

---

♦ ژئەنجامێ دابەشبوونا دایکە خانێ چەند خانێن نوی دروستدبن؟

---

## بەشێ 2 دابەشبوونا یەکسان دخانێن گیانەوەراندا

**2.** تێبینیا سلایدەکێ ئامادەیێ پلاستولاییێ ماسییێ بکە، ب بکارئینانا هێزا تەنە هاوێنا بچووک تێبینیا پلاستولاییێ بکە. هەر قۆناغەکێدا ژ قۆناغان خانەیەکێ ببینە، تێدا لیستا داهاتیێ ل خوارێ بکاربینە. دگەل هەر قۆناغەکێ خانەیەکێ وێنە بکە، دوێ بۆچشاییدا یا بۆ هاتیە بەرهەرکن ب ڕەخ هەر وەسفەکێڤە، ل دویڤ هەرەوەکو تو دبینی دسلایدێ تاییەت ب تەڤە. ناڤان بدانە سەر ئاو بەشێن خانێ ئەوێن دهێنە دیتن.

### وێنەیێ قۆناغ

مرۆڤ دشێت ناڤك وناڤکۆکێ ئاشکرا ببینیت.

مادێن بۆماوەیی ب شێوێ کرۆماتینی دیاردبن.

### قۆناغا بەری

تیشکە دەزییێن ب شێوێ ستێرەیێ لدۆر ناڤەندۆکان دروستدبن، ودناڤبەرا واندا تەشلە دێ دروستبن. کرۆمۆسۆم (جوتێن کرۆماتیدان) دێ وەلێهێن مرۆڤ ببینیت، ناڤکە بەرگ دێ بەرزەبیت. کرۆمۆسۆم دێ کورت وستووربن، و ب ئاشکرا دێ ل ناڤ خانێ دیاربن.

### قۆناغا ناڤەراستێ

کرۆمۆسۆم دێ ل ناڤەراستا خانێ ب درێژاهیا هێلا ناڤەراستێ ڕیزبن.

### قۆناغا ژێکجودابوونێ

کرۆماتید ل جهێ ناڤەندە پارچە دێ ژێکجودابن ودێ بەرەڤ ئاراستێ هەردوو جەمسەرێن بەرامبەری تێك ب درێژاهیا ڕیشالێن شیلەیی هێنە ڕاکێشان.

### قۆناغا دوماهیێ

کرۆمۆسۆم ل هەردوو جەمسەران دێ ب شێوێ بارستان دیاربن. دایکە خانە دێ دەست ب درێژبوونێ کەت، وجارەکا دی ل دۆر بارستێن کرۆمۆسۆمان ناڤکە پەردە دێ دروست بیتەڤە. کرۆمۆسۆم وتەشیلە ب ئاشکرایی دیارنابن. سایتۆپلازم دێ دنیڤەکێڕا زراڤ بیت هەتا هەردوو خانێن ژێ پەیدابن ل داوایا دەمێ قۆناغا دویماهییێ ژێکجودابن.

♦ خانان چ شێوە هەنە؟

♦ شێوێ كرۆمۆسۆمان وەسفبكە دەمێ ب ئاراستێ هەردوو جەمسەران دهێنە ڕاكێشان دماوێ قۆناغا ژێكجودابوونێدا.

♦ دەمێ دابەشبونا سایتۆپلازمی تەمامدبیت، ئەو چ قۆناغە یا هەردوو خانێن نوو گەهەشتینێ؟

**3.** لدویڤ ڕێنماییێن مامۆستایێ خۆ، خۆ ژوان ماددان ڕزگار بكە یێن تایبەت ب تەڤە.



**4.** جهێ كارێ خۆ پاقژ بكە، وبەری تو تاقیگەهێ بجە بهێلی دەستێن خۆ بشۆ.

## شلۆڤەكرن

**5.** ڕوویێ جوداهیێ چییە دناڤبەرا دابەشبوونا یەكسان دخانێن ڕووەكیدا ودابەشبوونا یەكسان دخانێن گیانەوەریدا؟

**6.** دكیژ قۆناغێدا ژقۆناغێن دابەشبوونا یەكسان جوداهیا مەزن دناڤبەرا خانێن ڕووەكی وخانێن گیانەوەریدا دیاردبیت؟ بەرسڤا خۆ ڕوونبكە.

## دەرئەنجام

**7.** لدویڤ هزراتە، ئەو چ ڕوولە یێ دابەشبوونا یەكسان پێ ڕادبیت سەبارەت زیندەوەران؟ بەرسڤا خۆ ب بەلگە دیاربكە.

## بەرفرەهەكرنا ئاسۆیێن هزركرنێ

**8.** دابەشبونا یەكسان دخانێن گۆپیتكا ڕەها پیڤازێدا پێدڤی ب ماوێ 80 خولەكان هەیە هەتا بجهدهێت هەكە تە سەحكرە سلایدەكێ گۆپیتكا ڕەهێ وتو ڕابووی ب هژمارتنا خانێن هەر قۆناغەكێ ژقۆناغێن دابەشبوونا یەكسان، وێ گاڤێ دێ شێی بڕا وی دەمی زانی یێ هەر قۆناغەك ژقۆناغان پێدڤی دبیت. ئەوژی دزڤڕیتەڤە بۆ ڕێژا سەدییا ژمارا خانان دقۆناغەكا دیاركریا دابەشبوونا یەكساندا، ڕێژا سەدی هاوتایێ وان 80 خولەكانە یێن قۆناغەكێ پێدڤی پێ هەی. ل دویڤ ڤان زانیاریان، ڕێكەكێ دیزاینكە (دانە) بۆ زانینا بڕا وی دەمی یێ هەر قۆناغەكێ ژقۆناغێن دابەشبوونا یەكسان پێدڤی پێ هەی.

**9.** ڤەكۆلینەكێ ئەنجامبدە ئارمانج ژێ دیاركرنا درێژیا ماوێ وی دەمی بیت یێ دابەشبوونا یەكسان دخانێن ڕووەك وگیانەوەراندا پێدڤی پێ هەی.

داهاتێن فێرکاریێ

پرۆگرامێ تاقیگەهێ

چالاکیێن تەکنیکاریێن تاقیگەهی
ودیزاینێن تاقیکرنێن تاقیگەهی

ناڤ ________________

بەروار ________ پۆل ________

# ج.1 بکارئینانا مایکرۆسکۆپێ

چالاکیا بنەرەتی

## شارەزایی

- بکارئینانا مایکرۆسکۆپا رووناهییێ یا ئاوێتە
- دروستکرنا سلایدەکی بۆ سامپلەکا شەهدار
- بکارئینانا مایکرۆسکۆپا تەندار

## دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- رادبیت ب کارەکێ رۆونکرنێ دبوارێ چەوانیا بکارئینانا راست ودروست بۆ مایکرۆسکۆپا رووناهیێ یا ئاوێتە وچاڤدانا وێ.
- رادبیت ب چرکرنا تیشکۆی بۆ مایکرۆسکۆپا رووناهییێ یا ئاوێتە دهێزا مەزنکرنا بچووك ومەزندا.
- سلایدەکێ مایکرۆسکۆپی بۆ سامپلەکێ تەر دروستدکەت دا کو ب رێکا مایکرۆسکۆپێ بهێتە پشکنین.
- رادبیت ب کارەکێ رۆونکرنێ دبوارێ چەوانیا بکارئینانا راست ودروست بۆ مایکرۆسکۆپا تەندار وچاڤدانا وێ.
- بەراوردیێ دکەت دناڤبەرا ڤەگۆهاستنا وێنێن ب مایکرۆسکۆپا رووناهییێ یا ئاوێتە دبینین وڤەگۆهاستنا وان وێنێن ب مایکرۆسکۆپەکا تەندار دبینین.

## کەرەستە (ماددە)

- مایکرۆسکۆپا رووناهییێ یا ئاوێتە
- سلایدەکێ ئامادە
- کاغەز بۆ باقژکرنا هاوێنان
- سلایدێن شوشەیی بۆ مایکرۆسکۆپێ (2)
- دەزی
- مایکرۆسکۆپەکا تەندار
- کلینکس
- رووەکێن بچووك وەکی کەڤزێ
- ئاڤ
- میچینك
- دەرزیکا توێکاریێ یان پێنڤیسێ رساسی
- داپۆشەرێن سلایدی (کەڤەر) (2)
- مەقەس (پێبرك)
- دلۆپێنەرا دەرمانان
- بەلگێن رووەکێ

## ئارمانج

نۆکە تو هاریکارێ تاقیگەهێی وتو هاتیە هەلبژارتن دا ببیە ئەندامەك دتیمەکا ڤەکۆلینێدا کو نوو یا هاتیە پێکئینان، و ب درێژاهیا سالێ دێ رابی ب تێبینیکرنا گەلەك ژزیندەوەران، وئەنجامدانا گەلەك تاقیکرنان. بۆ تەمامکرنا ڤان کاران، دڤێت تو ئامێرێن جۆراوجۆر بکاربینی. دێ مەشق وراهێنان ب تە هێتە کرن لسەر بکارئینانا مایکرۆسکۆپا رووناهییێ یا ئاوێتە ومایکرۆسکۆپا تەندار، هەروەسا دێ فێربی لسەر چەوانیا دروستکرنا سلایدەکێ مایکرۆسکۆپی بۆ سامپلەکێ تەر.

## پاشینە

دهەر جۆرەکیدا ژجۆرێن لێگەریانا زیندەیی ب تێزیکڤە، مایکرۆسکۆپی روولەکێ بنەرەت دگێریت. زانایێن زیندەزانییێ مایکرۆسکۆپێ بکاردئینن بۆ ڤەکۆلینا پێکهاتێن هوورێن خانە وشانان وتشتێن گەلەك بچووك ئەوێن ب چاڤی بتنێ نەهێنە دیتن. مایکرۆسکۆپا ژهەمیان پتر دهێتە بکارئینان مایکرۆسکۆپا رووناهییێ یا ئاوێتەیە، ئەوا رووناهییێ بکاردئینن دا کو وێنەکێ مەزن بۆ سامپلەکا دیارکری بدەتەمە. هەردوو جۆرێن مایکرۆسکۆپێن رووناهییێ ئەڤەنە: مایکرۆسکۆپا رووناهییێ یا ئاوێتە، ومایکرۆسکۆپا تەنداری.
مایکرۆسکۆپێن رووناهییێ یێن ئاوێتە دهێنە بکارئینان بۆ دیتنا زیندەوەرێن گەلەك بچووك وەکی خانێن پاراستی دسلایدێن شوشەییدا – سلایدێن مایکرۆسکۆپێ – وخانێن ب داپۆشەرێ سلایدی هاتینە داپۆشین. ئەو سلایدێ دهێتە ئامادەکرن دگەل هەبوونا ئاڤێ دناڤدا، دبێژنێ سلایدێ سامپلەکا تەر. مایکرۆسکۆپا تەنداری دهێتە بکارئینان بۆ ڤەکۆلینا سامپلێن مەزنتر ودیتنەکا سێ دووری بۆ رووێ سامپلی دابین دکەت.

دەمێ بکارئینانا مایکرۆسکۆپا رووناهییێ یا ئاوێتە، پتریا تشت وزیندەوەرێن هوور دناڤ دلۆپەکا ئاڤێدا دهێنە تێبینیکرن. ئەگەر تە وەسا دانا کو دلۆپەکا ئاڤێ وەکی برکەکێ بیت، ئەو تشت وزیندەوەرێن هوور تێدا لجهێ ماسیان بن، تو دێ دەستپێکەی ئەگەری زانی کا گرنگیا شیانا بجهئینانا چرکرنا تیشکۆیی چەندە، دکوراتیێن جودادا. بەردەوام چرکرنا تیشکۆی دهێتە کرن بۆ کوراتیا – بوارێ مایکرۆسکۆپێ لبن هێزا مەزنکرنا مەزن و ب رێکا رێکخەرێ بچووکێ مایکرۆسکۆپێ.

## ئەنجامدان

## پشکا 1 مایکرۆسکۆپا ڕووناهییێ یا ئاوێتە بنیاسە

**1.** داتاییێن ل خوارێ تەمام بکە دەمێ تو لسەر پشکا 1 کاردکەی.




**فرمانێن پارچێن مایکرۆسکۆپا ڕووناهییێ یا ئاوێتە**

| پارچا مایکرۆسکۆپیێ | فرمان |
|---|---|
| هاوێنا چاڤی (هێزا مەزنکرنێ:—) | |
| لەشە بۆڕی | |
| دەستك | |
| مێز | |
| ڕێکخەرێ مەزن | |
| ڕێکخەرێ بچووك | |
| گلۆپ یان خودیك | |
| پارچا دفنێ یا زڤڕۆك | |
| تەنە هاوێنا بچووك (هێزا مەزنکرنێ: ________) | |
| تەنە هاوێنا مەزن (هێزا مەزنکرنێ: ________) | |
| بەربەست | |
| بنکە | |

**2.** مایكرۆسكۆپەكێ ڤەگۆهێزە بۆ سەر مێزا خۆ دتاقیگەهێدا لدویڤ ئەوا مامۆستایێ تە ئاماژێ پێددەت. هشیاربە: مایكرۆسكۆپ یا گران بهایە وزوی خراب دبیت. یا گرنگە بكارئینانا وێ ب شێوەكێ ڕاست ودروست بیت دا كو چ زیان نەگەهنێ وسلاید نەهێتە شكاندن وسامپل ژناڤ نەچن، پشتڕاستبە ژجێگریا مایكرۆسكۆپێ لسەر مێزێ، ودووراتیا وێ ژلێڤێن مێزێ.

**3.** جهێ هەر پارچەكا مایكرۆسكۆپێ بزانە ئەوێن دلیستا خشتێ داتایاندا هاتی دوێنێ داتاییدا ئەوێ دلاپەڕێ بەری ڤیدا هاتی. تێبینیا هێزا مەزنكرنا هاوێنا چاڤی بكە (ژمارەكە ولدویڤدا نیشانا ×)، وتێبینیا هەردوو تەنە هاوێنان بكە ئەوێن هێزا مەزنكرنا بچووك ومەزن هەی. ڤان ژماران دخشتێ داتاییێن خۆدا تۆمار بكە.

**4.** ئەگەر مایكرۆسكۆپا تە گلۆپ پێڤە بیت، بگەهینە كارەبێ وبدە كاری. وئەگەر مایكرۆسكۆپا تە خودیك پێڤە بیت. خودیكێ ڕێك بێخە ب شێوەكی كو ڕووناهییێ چركەتە دناڤ وێ كونێدا ئەوا ل ناڤەڕاستا مێزا مایكرۆسكۆپێدا هەی. هشیاربە: ئەگەر مایكرۆسكۆپا تە خودیك پێڤە بیت تیشكا ڕۆژێ یا ئێكسەر بكارنەئینە وەك ژێدەرەك بۆ ڕووناهییێ. چونكی دبیت تیشكا ڕۆژێ زیانێ بگەهینتە چاڤێن تە.

**5.** پارچا تەنی بلندبكە (یان مێزێ نزمبكە) تا دوورترین بوارێ دشیاندابیت، ب ڕێكا زڤڕاندنا ڕێكخەرێ مەزن بەرەڤ خۆ. سلایدەكێ مایكرۆسكۆپی لسەر مێزێ ب ڕێكا بگرێن مێزێ جێگیربكە. پارچا تەنی یا هێزا مەزنكرنا وێ بچووك بزڤڕینە و ل جهێ وێ ل هنداڤ مێزێ جێگیر بكە. دەمێ تو ب چاڤی چاڤدێریا مێزێ دكەی، ولسەر ئاستێ وێ، دهەمان دەمدا ڕێكخەرێ مەزن بكاربینە بۆ جێگیركرنا پارچا تەنی ل نێزیكترین حالا دشیاندابیت ژسلایدێ مایكرۆسكۆپی بێی كو پارچە ب سلایدی بكەڤیت.

**6.** ب پارچا چاڤی لێبنێرە. هەردوو چاڤێن خۆ بەردەوام بهێلە ڤەكری دەمێ تو ب ڕێكا پارچا چاڤی لێدنێری، چونكی ئەڤ چەندە نا هێلیت چاڤێن تە ب وەستێن. ئەگەر هاوێنە یا پیس بیت، ژمامۆستایێ خۆ بخازە ڕێكا پاقژكرنا وێ بۆ تە دیاربكەت. هشیاربە: چ تشتان ژبلی كاغەزا تایبەت بۆ پاقژكرنا هاوێنێن مایكرۆسكۆپێ بكارنەئینی. چركرنا تیشكۆی ڕێكبێخە ب ڕێكا ڕێكخەرێ مەزن ئەوژی ب زڤڕاندنا وێ بەرەڤ ئاراستێ بەرامبەر تە. (بۆ پێشڤە). هشیاربە: نابیت چركرنا تیشكۆی بۆ پارچێن (هاوێنێن) تەنی ڕێكبێخی ب لڤاندنا وی بەرەڤ خارێ. چونكی دبیت هاوێنا تەنی ب سلایدێ مایكرۆسكۆپی بكەڤیت وببیتە ئەگەرێ شكاندنا وی وزیانێ ژی بگەهینتە هاوێنا تەنی.

**7.** ڕێكخستنا چركرنا تیشكۆی تەمامبكە ب ڕێكا زڤڕاندنا ڕێكخەرێ مەزن بەرەڤ هەردوو ئاراستان. دەمێ چركرنا تیشكۆی چێبوو بۆ وی تشتێ تو لێنێرینا وی دكەی وئەوێ ناڤەڕاستا بوارێ دیتنێ داگیردكەت، هێزا مەزنكرنا مەزن بكاربینە. هشیاربە: نابیت ب هیچ ڕەنگەكی ڕێكخەرێ مەزن بكاربینی لژێر هێزا مەزنكرنا مەزن.

## پشكا 2 دروستكرنا سلایدەكێ مایكرۆسكۆپی بۆ سامپلەكا شەهدار

**8.** پێبركێ بكاربینە بۆ برینا پیتا «س» ژرۆژنامەكێ. هشیاربە: پیتا «س» ژناڤ ونیشانێن مەزن ژرۆژنامێ بكارنەئینە. هشیاربە: پێبركێ ب هشیاری بكاربینە. مامۆستایێ خۆ ئاگادار بكە ئەگەر هەر تووشبوونەك ژئەنجامێ بكارئینانا پێبركێ ڕوودا.

**9.** ب ڕێكا دلۆپێنەرا پزیشكی، دلۆپەكا ئاڤێ بەردە سەر سلایدەكێ مایكرۆسكۆپی یێ شوشەییێ باقژ. هشیاربە: ماددێن شوشەیی زوو دشكێن. بلەز مامۆستایێ خۆ پێ ئاگادار بكە لدۆر هەر شوشەكا دهێتە شكاندن یان هەر تووشبوونەكا ڕوودەت. نە ڕابە ب لادانا پرتێن شوشێن شكەستی یان شلێن ڕێژتی ئەگەر مامۆستایێ تە ژتە نەخازت. ب بكارئینانا میچینكی، پیتا «س» بدانە د دلۆپا ئاڤێدا، هەر وەكی دوێنێ لاپەرێ بهێتدا دیار.

**10.** داپۆشەرێ سلایدی ب گۆشا 45 پلە بگرە، و ل بەر لێڤا دلۆپا ئاڤێ هەروەكی د شێوێ خارێدا دیار. داپۆشەرێ سلایدی هێدی هێدی نزمبكە دا كو پەقیشكێن هەوای دروست نەبن. پەقیشكێن هەوای لبن مایكرۆسكۆپێ دێ گرۆڤر وەرەخێن وان تاری دیاربن.




**11.** سلایدێ سامپلا شەهدار بدانە سەر مێزا مایكرۆسكۆپێ، كو پیتا (س) ب ئاراستەی تەبیت. ب پشتەبەستن ب هاوێنا تەنێ یا هێزا مەزنكرنا وێ بچووك، چركرنا تیشكۆی لسەر پیتا (س) بجهبینە پاشی هەرە بۆ هێزا مەزنكرنا مەزن.

♦ چ دوێنێ پیتا (س) دا روودەدەت دەمێ تو ژهێزا مەزنكرنا بچووك دهێیە ڤەگۆهاستن بۆ یا مەزن؟

---

---

---

**12.** دەمێ تو ب هاوێنا چاڤی لێنێرینێ دكەی، بەربەستی رێكبێخە تا رووناهیەكا گونجای بۆ دیتنێ بدەستە تە دكەڤیت.

♦ چ روودەدەت دەمێ تو بەربەستی رێكدئێخی؟

---

**13.** ئوتو یێ لێنێرینێ ب مایكرۆسكۆپێ دكەی، تبلێن خوە بكاربینە بۆ لڤاندن ولابرنا سلایدی بۆ لایێ راستێ، پاشی بۆ لایێ چەپێ.

♦ چ روودەدەت دەمێ تو سلایدی بۆ لایێ راستێ ڤەدگۆهێزی؟

---

♦ چ روودەدەت دەمێ تو سلایدی بۆ لایێ چەپێ ڤەدگۆهێزی؟

---

♦ سلایدی لابە كو ژتە دویر بكەڤیت، وكا ل چ وێنەی دهێت تۆماربكە؟

---

## بەشێ 3 ڕێكخستنا چڕكرنا تیشكۆی بۆ كوراتیا بوارێ مایكرۆسكۆپی

**.14** سلایدەكێ مایكرۆسكۆپییێ تەڕ بۆ دوو دەزووان ئامادە بكە ئەوژی ب ڕێكا دانانا هەردوو دەزووان ب شێوەكێ ئێكتر بڕ ل ناڤەڕاستا سلایدەكێ مایكرۆسكۆپییێ شوشەییێ باقژ. دلۆپێنەرا پزیشكی بكاربینە بۆ دانانا دلۆپەكا ئاڤێ. سلایدێ شوشەیی ب داپۆشەرێ سلایدی داپۆشە.

**.15** سلایدێ خۆیێ مایكرۆسكۆپییێ شەهدار بدانە سەر مێزا مایكرۆسكۆپێ لبن هێزا مەزنكرنا بچووك. سلایدی لسەر مێزا مایكرۆسكۆپێ جێگیر بكە كو خالا ئێكتر بڕینا هەردوو دەزووان بكەڤیتە ناڤەڕاستا بوارێ دیتنا تە. چڕكرنا تیشكۆی بۆ هەردوو دەزووان ڕێكبێخە.

- ♦ ئەرێ تو دشێی هەردوو دەزووان پێكڤە و ب ڕوون وئاشكرایی دهەمان دەمدا دسەنتەرێ تیشكۆیدا ببینی؟

**.16** هەڕە بۆ هێزا مەزنكرنا مەزن.

- ♦ ب بكارئینانا ڕێكخەرێ بچووك، ئەرێ تو دشێی هەردوو دەزووان پێكڤە و ب ڕوون وئاشكرایی دهەمان دەمدا دسەنتەرێ تیشكۆیدا ببینی؟ بۆچی؟

---

**.17** ڕێكخەرێ بچووك هێدی بزڤڕینە بۆ هەردوو لایان وكریارا چڕكرنا تیشكۆی بۆ بەشێن جودا ژهەردوو دەزووان ئەنجامبدە، ئەوژی وەك ڕاهێنانەك.

## بەشێ 4 بەراوردی دناڤبەرا مایكرۆسكۆپا تەنداری ومایكرۆسكۆپا ڕووناهیێ یا ئاوێتە

**.18** بەرێ خۆ بدە مایكرۆسكۆپا تەنداری وپارچێن وێ یێن بناڤكری بنیاسە، دوێنێ خارێدا. جوداهیێ دناڤبەرا ڕێكێن بكارئینانا ڤێ مایكرۆسكۆپێ وڕێكێن بكارئینانا مایكرۆسكۆپا ڕووناهیێ یا ئاوێتە دەستنیشانبكە. بەراوردیێ بكە دناڤبەرا دووریا كاركرنێ (ماوە دناڤبەرا هاوێنا تەنی ومێزێدا) بۆ مایكرۆسكۆپا تەنداری ودووریا كاركرنا مایكرۆسكۆپا ڕووناهیێ یا ئاوێتە.



♦ دووریا كاركرنیٚ چەوا كارتێكرنیٚ لسەر پیڤانا وان تەنان دكەت یێن ب رێكا مایكرۆسكۆپا تەنداری دهێنە دیتن.

19. بارستەكیٚ ژكەڤزیٚ، یان ژبەلگیٚ رووەكی، بدانە سەر كلینكسەكیٚ، وبدانە سەر مێزا مایكرۆسكۆپا تەنداری. چركرنا تیشكۆی بۆ بەشەكی ژكەڤزیٚ یان بەلگیٚ رووەكی بجهبینە. كلینكسیٚ بۆ لایێ چەپیٚ ڤەگۆهێزە.
♦ بەراوردییٚ بكە دناڤبەرا ڤینا ویٚ رووەكا تو ب هاوێنا چاڤی دبینی وئاراستیٚ ڤاندنا رووەكیٚ.

♦ وێنە چەوا دهێتە ڤەگۆهاستن دەمیٚ دیتنا وی ب مایكرۆسكۆپا تەنداری ب بەراوردی دگەل دیتنا وی ب مایكرۆسكۆپا رووناهییٚ یا ئاوێتە؟

20. مایكرۆسكۆپێن رووناهییٚ یێن ئاوێتە كاردكەن ب رێكا تێپەربوونا رووناهییٚ دناڤ وان تەناندا یێن مە دڤێت ئەم ببینین. لیٚ هەمی تەن نە دنیمچە روونن. هندەك ژوان نە دروونن، ورووناهی نەشێت دناڤرا بچیت. رابە ب دروستكرنا سلایدێن مایكرۆسكۆپیٚ یێن شەهدار بۆ كەڤزەكیٚ وبۆ پارچەكا بچووك ژبەلگیٚ رووەكەكیٚ.
تێبینیا سلایدێن مایكۆسكۆپی یێن شەهدار بكە لبن هێزا مەزنكرنا بچووك.
♦ بەراوردییٚ بكە دناڤبەرا دیتنا تە بۆ كەڤزیٚ ودیتنا تە بۆ بەلگیٚ رووەكیٚ.

♦ دەمیٚ تو ب مایكرۆسكۆپا رووناهییٚ یا ئاوێتە بەریٚ خۆ ددەیە تەنەكیٚ نەییٚ روون، تو دشێی چ ببینی؟

21. بەلگیٚ رووەكەكیٚ بدانە بۆ دیتنا وی ب مایكرۆسكۆپا تەنداری. ژێدەریٚ رووناهییٚ رێكبێخە، كو رووناهی بكەڤتە سەر رووی بەلگی، ودناڤرا نەچیت.
♦ ئەڤ رێكا رووناهیكرنیٚ بۆ تەنەكیٚ دیاركری چەوا رێكیٚ ددەتە تە بۆ تێبینیكرنا وان تەنان یێن ب رێكا مایكرۆسكۆپا رووناهییٚ یا ئاوێتە نەهینە دیتن.

22. لدویڤ رێنماییێن مامۆستای خۆ ژوان مادداں رزگاربكە یێن تە بكارئینایین.

## شلۆڤەكرن

**.23** جهێ كاركرنا خۆ پاقژ بكە ودەستێن خۆ بشۆ بەری تو ژتاقیگەهێ دەركەڤى.

**.24** ژمارا مەزنكرنێ ئەوا لسەر هاوێنا چاڤى تۆماركرى چ دگەهينيت.

**.25** سەرجەمێ مەزنكرنێ بۆ مايكرۆسكۆپا خۆ هەژماربكە دهێزا مەزنكرنا بچووك ومەزندا. لبيرا تەبيت كو تو يێ ب دوو هاوێنان بەرێ خۆ ددەيە سامپلەكى يا تەنى ويا چاڤى. (ئاماژە: هێزا مەزنكرنا هاوێنا چاڤى لێكبدە ب هێزا مەزنكرنا هاوێنا تەنى). ئەوا تو پێ ڕابووى ديار بكە.

**.26** ئەرێ لبن هێزا مەزنكرنا بچووك يان يا مەزن بوارێ ديتنێ دێ پتر يێ ئاشكرابيت؟

**.27** چ ل بوارێ ديتنێ دهێت دەمێ تو ژهێزا مەزنكرنا بچووك دچيە هێزا مەزنكرنا مەزن؟

**.28** دەمێ دروستكرنا سلايدەكێ مايكرۆسكۆپى بۆ سامپلەكا شەهدار، بۆچى دڤێت تو داپۆشەرێ سلايدى بكاربينى؟

**.29** بۆچى دڤێت چڕكرنا تيشكۆى بۆ كوراتييێن جۆرا وجۆر بهێتە بجهئينان؟

**.30** بۆچى تەن ب شێوێ سێ دوورى دياردبن لدەمێ بكارئينانا مايكرۆسكۆپا تەندارى.

## دەرئەنجام

**31.** ئەگەر زیندەوەرەکێ هور دبواری دیتنێ یێ مایکرۆسکۆپا ڕووناهییێ یا تەندا راردا مەلڤانیا بکەت ژلایێ ڕاستێ بۆ لایێ چەپێ، دێ سلایدێ مایکرۆسکۆپی بۆ کیژ لای لڤینی دا بمینتە دبوارێ دیتنێدا؟ بۆچی؟

**32.** ئەگەر هەمان ئەو زیندەوەر دناڤ بوارێ دیتنێ یێ مایکرۆسکۆپا تەندا راردا مەلڤانیا بکەت ژلایێ ڕاستێ بۆ لایێ چەپێ، دێ سلایدێ مایکرۆسکۆپی بۆ کیژ لای لڤینی دا بمینتە دبوارێ دیتنێدا؟ بۆچی؟

**33.** دکیژ باریدا مایکرۆسکۆپ دێ ئامێرەکێ ب مفا بیت بۆ زیندەزانان؟

**34.** قوتابیەک دێ پارچەکا نانێ کیفکۆیی ئینیت. دێ کیژ مایکرۆسکۆپێ بکارئینی بۆ دیتنا کیفکۆیی؟ بۆچی؟

## بەرفرەهکرن ئاسۆیێن هزرکرنێ

**35.** تەکنیککارێن ڤەکۆلینان مایکرۆسکۆپان بکاردئینن بۆ ڤەکۆلین ونیاسینا گەلەک تشتان. ل وان ڕاهێنان وشارەزاییێن پێتڤی بگەڕە دا ببیە کەسەکێ تەکنیککار دبوارێ ڤەکۆلینێدا.

**36.** زێدەباری مایکرۆسکۆپێن ڕووناهییێ، نوکە زانایێن زیندەزانییێ جۆرێن جودا ژمایکرۆسکۆپان دجالاکییێن خۆ یێن ڕۆژانە دا بکاردئینن. ل لایەنێن جوداهییێ وهێزا مەزنکرنێ دڤان مایکرۆسکۆپاندا ڤەکۆڵە: مایکرۆسکۆپا ئەلکترۆنی، مایکرۆسکۆپا ئەلکترۆنیا پشکنەر، مایکرۆسکۆپا ئەلکترۆنیا تێپەڕ، مایکرۆسکۆپا ئەلکترۆنیا تونێلییا پشکنەر.

ناڤ ____________________

بەروار ____________ پۆل ____________

**ج.2**
چالاکیەکا زەنگینکرنێ

# هێلکارییا کرۆمۆسۆمان

## شارەزایی

- دانانا هێلکارییا کرۆمۆسۆمان
- شلۆڤەکرنا هێلکارییا کرۆمۆسۆمان

## دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- جووتەکی ژکرۆمۆسۆمێن وەکهەڤ **دناسیت**، ب رێکا درێژیا وان، وجهێ ناڤەندە پارچێ، وشێوازێ هێلان تێدا.
- توخمێ تاکی **دەستنیشاندکەت**، ب پشتبەستن ب هێلکارییا کرۆمۆسۆمان.
- سلامەتیا تاکی یان تووشبوونا وی ب بارێ داونی **پێشبین دکەت**.

## مادده

- کۆمەکا بەلاڤکری ژکرۆمۆسۆمان
- پێبڕك (مەقەس)
- راستەکێ مەتری
- شێوەك بۆ هێلکارییا کرۆمۆسۆمێن مرۆڤی
- شریتا پێڤە نیسیانێ یا ڕوون

## ئارمانج

ئێك ژئەرکێن تە، وەك تەکنیککارەك دتاقیگەهەکا پزیشکیدا ئەوە تو هاریکاریێ بکەی دئەنجامدانا پشکنینەکا بەری ژدایکبوونێدا. ئاسایی تو یێ کار دکەی لسەر بارێ ژن ومێرەکی. ژن یا دووگیانە وپزیشکێ وی یا ژێ خواستی پشکنینەکێ بۆ شلێ ئەمینوسی ئەنجامبدەت، کو ئەوژی جۆرەکێ پشکنینێ یێ بەری ژدایکبوونێیە. وێنێن مایکرۆسکۆپی بۆ کرۆمۆسۆمێن زارۆیەکێ هێشتا ژدایك نەبووی دانە تە، کو ب رێکا پشکنینا شلێ ئەمینوسی یێ بدەستڤە هاتین. کارێ تە ئەوە تو هێلکارییا کرۆمۆسۆمان بۆ ڤان خانان وشلۆڤەکرنا وان تەمامبکەی، ب ئارمانجا دەستنیشانکرنا توخمێ زارۆکێ ڤان ژن ومێران وداکو بزانین کا ئەڤ زارۆکە یێ ساخلەمە یان ژی بارێ داونی لدەڤ هەیە.

## پاشینه

مرۆڤ دهەر خانەکا جووت کۆما کرۆمۆسۆمیدا ( 2n ) ژلەشێ وی 46 کرومۆسۆم هەنە.
کرومۆسۆمێن خانا جووت کۆما کرۆمۆسۆمی لسەر شێوێ جووتێن وەکهەڤن، ئەوژی جووتێن کرۆمۆسۆما نە دوەکهەڤن دشێوە وقەبارە وجهێ ناڤەندە پارچێ تێدا مرۆڤی 22 جووت ژکرۆمۆسۆمێن وەکهەڤ هەنە دبێژنێ لەشە کرۆمۆسۆم، وجووتێ بیست وسێ ئەوە یێ توخمێ تاکی دەستنیشاندکەت، وتوخمە کرۆمۆسۆمان پێکدئینیت. مێیان ئێك جۆر ژکرۆمۆسۆمێن توخمی یێن هەین، دبێژنێ کرۆمۆسۆما X. لێ نێران دوو جۆر ژکرۆمۆسۆمێن توخمی هەنە، کرۆمۆسۆمەکا X، وکرۆمۆسۆمەکا Y یا گەلەك ژێ بچووکتر. وێنێ هێلکاری، لسەرێ لاپەرێ بهێتدا هەر 22 جووتێن لەشە کرۆمۆسۆمان وهەردوو جۆرێن توخمە کرۆمۆسۆمان دیاردکەت.

**هێلکارییا کرۆمۆسۆمان** وێنەیەکێ هێلکارییە کرۆمۆسۆمێن خانەکێ ب رێز بەندی ژ یا ژهەمیان مەزنتر بۆ یا ژهەمیان بچووکتر دیار دکەت. هێلکارییا کرۆمۆسۆمان پێکدهێت ژوێنەکێ مایکرۆسکۆپی بۆ کرۆمۆسۆمێن خانەکێ کو یا دقۆناغا کەمەرەییا دابەشبوونا خۆدا. وێنێن فۆتۆگرافیێن کرۆمۆسۆمان دێ هێنە برین ورێزبەندکرن لدویف قەبارە وشێوێ جووتێن کرۆمۆسۆمێن وەکهەڤ. دبیت هێلکارییا کرۆمۆسۆمان بۆ هەر تاکەکی بهێتە شلۆڤەکرن بۆ دەستنیشانکرنا توخمێ وی وزانینا ڕێتێچوونا هەبوونا هەر تێکچوونەکا کرۆمۆسۆمی لدەڤ وی تاکی. بۆ نموونە، هێلکارییا کرۆمۆسۆمێن مێیە. دوو کرۆمۆسۆمێن X دیاردکەت وهێلکارییا کرۆمۆسۆمێن نێری کرۆمۆسۆمەکا X وکرۆمۆسۆمەکا Y دیاردکەت.




ویتریا جاران تێکچوونێن کرۆمۆسۆمی پەیدادبن ژکریارا ژێکڤەبوونێ، واتە کرۆمۆسۆم نەشێن ب شێوەکێ ڕاست ودروست ژێکڤەببن ددەمێ کەمە دابەشبوونێدا. ژێك نەڤەبوون دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا خانان کو ژمارەکا زێدە یان یا کێم ژکرۆمۆسۆمان تێدایە. کۆما سێ کرۆمۆسۆمیا وەکهەڤ تێکچوونەکە دهێتە جوداکرن ب هەبوونا کرۆمۆسۆمەکا زێدە، یان بەشەك ژکرۆمۆسۆمەکێ دخانەکێدا. ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە کو خانێ ل شوینا 46 کرۆمۆسۆمان 47 کرۆمۆسۆم تێدانە. بارێ داون، یان کۆما سێ کرۆمۆسۆمییا ژمارە 21، تێکچوونەکا کرۆمۆسۆمییە پەیدادبیت ژئەنجامێ هەبوونا کرۆمۆسۆمەکا زێدە دجووتێ (21) ێ دا.

## ئەنجامدان

**1.**  هەرکرۆمۆسۆمەکێ ب هشیاری ببڕە، دا کو بهێتە جوداکرن ژکۆما کرۆمۆسۆمێن بەلاڤە. پشتڕاستبە ژهێلانا لێڤەکا بچووك لدۆر هەر کرۆمۆسۆمەکێ.

**2.** کرۆمۆسۆمان ڕێکبێخە لسەر شێوێ جووتێن وەکهەڤ. دڤێت کرۆمۆسۆمێن هەر جووتەکی ب هەمان درێژی بن، وناڤەندە پارچە تێدا هەمان جهی داگیر بکەن. ڕاستەی بکاربینە بۆ پیڤانا درێژیا کرۆمۆسۆمێ وزانینا جهێ ناڤەندە پارچێ. جووتێن کرۆمۆسۆمان ڕێزبەند بکە، لدویف درێژیا وان ب دەستپێکرن ژ یا ژهەمیا مەزنتر وتا گەهشتن بۆ یا ژهەمیان بچووکتر. دبیت شێوازێ دابەشبوونا هێلان دکرۆمۆسۆماندا هاریکاریا تە بکەت بۆ دەستنیشانکرنا جووتێن کرۆمۆسۆمێن وەکهەڤ.

**3.** چەند هێلەکا ب پانی بکێشە وشەریتا پێڤە نیسیانێ بکاربینە بۆ جێگیرکرنا هەر جووتەکی ژکرۆمۆسۆمێن وەکهەڤ، لسەر شێوێ هێلکارییا کرۆمۆسۆمێن مرۆڤی، ب مەرجەکی کو ناڤەندە پارچێن کرۆمۆسۆمان بکەڤنە سەر هێلان. جووتێن کرۆمۆسۆمان ب ڕێزبەندی بدانە، جووتێ درێژتر ل جهێ ژمارە 1 وجووتێ کورتتر ل جهێ ژمارە 22 وکرۆمۆسۆمێن توخمی ل جهێ ژمارە 23.

**4.** ئەو هێلکاریێ تە ئەنجامدای هێلکاریێ کرۆمۆسۆمانە. هێلکاریێ کرۆمۆسۆمان شلۆڤە بکە بۆ دەستنیشانکرنا توخمێ تاکی، ودەستنیشانکرنا ساخلەمی یان نە ساخلەمییا هێلکاکارییا کرۆمۆسۆمان.

**5.** لدویڤ رێنماییێن مامۆستای خوٚ ژوان مادە‌دان رزگار بکە یێن تە بکارئینایین.

## شلۆڤەکرن

**6.** باش سەحکە هێلکاریێ کرۆمۆسۆمان یێ تایبەت ب تەڤە. ئەرێ زارۆك یێ نێرە یان یێ مێیە؟ ئەرێ دێ باریێ داون لدەڤ هەبیت؟ تە چەوا زانی؟

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

**7.** کرۆمۆسۆما Y گەلەك وەکی هندەك کرۆمۆسۆمێن دییە. چ لسەر تە پێتڤیە تو بکەی دا دەستنیشانبکەی کو کرۆمۆسۆما (X) ە؟

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

**8.** ئەگەر ئەو هێلکاریێ کرۆمۆسۆمان یێ تە دانای یێ مێیەکێ بیت وباریێ داون لدەڤ هەبیت، ئەو چ جوداهینە دڤێت ب ئاشکرایی دەربکەڤن.

______________________________

______________________________

______________________________

## دەرئەنجام

**9.** ئەگەر ئەرکێ تە ئەو بیت تو وان ژن ومێران ئاگەهدار بکەی ب ئەنجامێن پشکنینا تایبەت ب وانڤە، تو دا چ بێژیە وان؟

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

**10.** بۆچی هێلکارییێن کرۆمۆسۆمان دهێنە هژمارتن ئامرازێن گەلەك گرنگ بۆ زاناییێن بۆماوێ؟

______________________________

______________________________

______________________________

______________________________

## بەرفرەهكرنا ئاسۆیێن هزركرنێ

**11.** شیرەتكار دبواری بۆماوێدا، لسەر وان ژن ومێران كاردكەن ئەوێن ئێك ژوان جینەكێ زیاندار هەبیت ودبیت بهێتە ڤەگوهاستن بۆ زارۆكێ وان. شیرەتكار ڕادبن ب ڤەكۆلێنا مێژوویا خێزانێ، وپشكنینان لسەر خوینێ دكەن بۆ ئاشكراكرنا جینێن زیاندار. پاشی ڕادبن ب پێشبینكرنا ڕێتێچوونا پشكداریكرنا ئێك ژدەیبابان بۆ ڤەگوهاستنا جینەكێ زیاندار بۆ زارۆكی. پاشی كەسوكار دشێن بڕیارێ بدەن ب پشتبەستن ب پێزانینان لدۆر زارۆكبوونێ. ڤەكۆلێنەكێ بكە لسەر وان شارەزاییێ وڕاهێنانێن پێتڤی یێن وەدكەن كو كەسەك ببیتە شیرەتكار دبوارێ بۆماوێدا.

**12.** ب ڤەكۆلێنان ڕابە لدۆر نەخۆشییێن بۆماوەیی. پێزانینان كۆمكە لدۆر بارێن تووشبوونێ ب نەخۆشییێن بۆماوەیی، لدویڤ چینا ژی (عەمری)، وژمارا بارێن تووشبوونێ. ئەو تشتێ تە دیتی دگەل شێوێن داتایی و وێنان نیشانبدە.

# ڕاپۆڕتا تاقیگەهییا نموونەیی

## ڕێنمایێن گشتی

دڤێت قوتابی پێگیریێ ب ڤان تشتان بکەن.

- ئەنجامدانا چالاکییا تاقیگەهی لدویڤ پێنگاڤێن دەستنیشانکری دهەر چالاکیەکا کریاریدا بۆ هەر بەندەکی.
- جەختکرن لسەر برگا (هشیاربە).
- ئەنجامدانا چالاکییێ ددەمێ دەستنیشانکریدا.
- پێگیری ب هەمی ڕێنمایێن هێمن وسلامەتییێ یێن گرێدای ب چالاکیا کریاریڤە.

## دانانا ڕاپۆڕتێ

دڤێت ڕاپۆرتا تاقیگەهی ئەڤان بخۆڤە بگریت:

- ناڤونیشانا چالاکیا کریاری.
- ئارمانج
- کورتیا ئەنجامدانێ وپێزانینان (خشتە، وێنێن داتایی، وێنێن هێلکاری).
- بەرسڤ وتێبینی لسەر پرسیارێن شلوڤەکرنێ ودەرئەنجامان.

ناڤ ______________________

بەروار ____________ پۆل ____________

چالاکیەکا کریاری
بۆ بەندێ 1

# مودێلەك لسەر ڕاپۆرتا تاقیگەهێ

أ. **ناڤونیشان** بەراوردکرنا خانێن گیانەوەری و ڕووەکی

ب. **ئارمانج** جوداکاریکرن دناڤبەرا لایەنێن وەکهەڤ وجوداهیان

ج. **کورتیا ئەنجامدانێ وپێزانینان**

## بەشێ أ خانێن گیانەوەری

**1.** تێبینیکرنا سلایدەکێ ئامادە بۆ ڕووکەشە خانان ب ڕێکا مایکرۆسکۆپێ لبن هێزا مەزنکرنا بچووك پاشی لبن هێزا مەزنکرنا مەزن.

**2.** وێنەیەکێ هێلکاری بۆ ڕووکەشە خانان هەر وەکی لبن مایکرۆسکۆپێ دەردکەڤن.

| | |
|---|---|
| وێنەك بۆ ڕووکەشە خانان لبن هێزا مەزنکرنا بچووك (____ **X**) | وێنەك بۆ ڕووکەشە خانان لبن هێزا مەزنکرنا مەزن (____ **X**) |

## بەشێ ب خانێن ڕووەکی

**1.** تێبینیکرنا سلایدەکی بۆ بەلگەکێ بچووك ژلوتکا لقەکێ ئیلۆدیایێ ب ڕێکا مایکرۆسکۆپێ ولبن هێزا مەزنکرنا بچووك ومەزن.

**2.** وێنەکێ هێلکاری (نەیێ بۆیاغکری) بۆ بەلگەکێ ئیلۆدیایێ هەروەکی لبن مایکرۆسکۆپێ دەردکەڤیت.

| | |
|---|---|
| وێنێ هێلکاریێ بەلگێ ئیلۆدیایێ لبن هێزا مەزنکرنا بچووك (____ **X**) | وێنێ هێلکاریێ بەلگێ ئیلۆدیایێ لبن هێزا مەزنکرنا مەزن (____ **X**) |

8. لێنێرینا نموونێ گیانەوەرێ زیندی بكە كو تو دشێی دنیشتگەهێ ژینگەیدا سەروژنوی بەرەلا بكەی بێی كو هیچ زیانەك گەهشتبیتێ. پشكنینا چ گیانەوەرێن برپرەپرادەر نەكەی بێ رەزامەندیا مامۆستای.

9. مامۆستایێ تە پرۆگرامەكی بۆ كریارا راڤكرنێ ددانیت ب رێنماییێن مامۆستایێ خۆ یێ پێگیربە دەرباری دەمێ دەستپێكرنێ ودەمێ راوەستیانێ ژكریارا راڤكرنێ، دەمێ تو بەندەكی دبینی كو دلیستا لبەر دەستێ تەدا هەبیت دانە دناڤ خشتێ داتایان دا. سەرنجێ بدە. بنڤێسە دستوینا گونجایدا دخشتێ داتاییێن خۆدا. وەهە زیندەوەرەكێ دی كو سیفەتا نە ئاساییی هەی ددەڤەرێدا دبینی.

## شلۆڤەكرن

10. وەسفەكا هۆكارێن زیندی ونەزیندی بنڤێسە كو دتاییەتن ب وی نیشتگەهێ ژینگەی یێ كو تە ڤەكۆلینا خۆ لسەر كری.

________________________________________

________________________________________

________________________________________

________________________________________

## دەرئەنجام

11. زنجیرەكا خوراكی پێكبینە بۆ وان گیانەوەر ورووەكێن دناڤ لیستاندا یان یێن تە دیتین بۆ نموونە: «تشتەكێ رەنگ سۆر» رەنگێ گولەكێ. یان بالندەك یان بەلگەكێ لێك ئالیای بیت، دبیت بەلگەكێ سەرخسی بیت وهۆسا ب ڤی شێوی.

________________________________________

________________________________________

12. تۆرەكا خوراكی پێكبینە بۆ وان گیانەوەر ورووەكێن دلیستێدا هەین. وێنێ وێ تۆرێ دڤێ ڤالاییێدا چێبكە.

## بەرفرەهکرنا ئاسۆییێن هزرکرنیٚ

13. چەوا دشیاندایە دەوروبەریٚ ژینگەیا ویٚ نیشینگەییا ژینگەیی کو تە ڤەکۆلێنا خۆ لسەر کری دسالٚا بهێتدا بگوهۆڕی وکار بکەتە سەر ڤیٚ تاقیگەییٚ. لسەر قوتابیێن زیندەوەرزانییٚ ل سالٚا بهێتدا.

14. دگەل هە=ڤالێن پۆلا خۆ گەشتەکا (گەریانەکا) مەیدانی بکە، بۆ نیشینگەیەکا تەمام جودا ژویٚ نیشینگەیا تە ڤەکۆلێن لسەر کری بۆ نموونە ئەگەر دگەشتا مەیدانی یا خۆ یا ئێکێدا چوبیە دەڤەرەکا نە ئارام پێدڤیە ڤیٚ جاریٚ بچینە کەناریٚ ئاڤەکیٚ یان پارچە ئەردەکیٚ چۆل ژشاری. پێگیرییٚ ب ڕێنماییێن مامۆستاییٚ خۆ بکە. وەکی بەریٚ ڕاپۆرتەکیٚ لسەر ئەوا تە دیتی بنڤێسە.

## بەندێن «ڕاڤكرنا چرِ و گشتی»

1. پارچەكا هەستيەكی
2. گيانەوەرەكێ ب ستری (دڕكايی)
3. تەڤنپيركەك (جالجالۆكەك)
4. مێرووييەكا بێ پەڕ (بێ بال)
5. گيانەوەرەكێ نەرمۆڵە
6. كرمەكێ ئەلقەيی
7. كرمەكێ دەزيلەيی
8. مێرووييەكا ب پەڕ (بالدار)
9. متبوو (دناڤبەرا كرمۆكە ومێرووييەكا گەهشتيدا)
10. كرمۆكەيەك
11. تشتەكێ گوێی
12. تشتەكێ ئاووگدار (تەڕ)
13. تشتەكێ ڕەنگ سپی
14. تشتەكێ زەوزايێ (ژاوژاوێ) دروست بكەت
15. پەڕ (ژبالندەيەكی)
16. حەفت پارچە ژپاشەرۆكێ كو مرۆڤ بجە بهێليت
17. تشتەكێ جوان
18. بەشەكێ ژڕووەكی پشتی جوينا وی (نە ژلايێ مرۆڤيڤە)
19. گوێيەكێ ژپاشمايێ گيانەوەری
20. كەڕوويەك لسەر دارێ بژيت
21. كەڕوويەك لسەر ئەردی بژيت
22. گرێيەكا (دەرەنە) ڕووەكی
23. بەلگێ ڕووەكەكی تۆڤێ وی ئێك لەپ بيت
24. بەلگێ ڕووەكەكی تۆڤێ وی دوو لەپ بيت
25. پاشماوێ كەوالی (ئاژەڵی)
26. تشتەكێ قەبارە مەزن بيت
27. تشتەكێ شێوە ڕاست
28. تۆڤ كو با وان ڤەدگوهێزيت
29. تۆڤ كو گيانەوەر ڤەدگوهێزيت وبەلاڤە دكەت
30. 50 پارچە ژهەر بەندەكی بيت
31. ستريە (دڕكە) ڕووەك
32. نموونەيەكا لێ ئێكدانێ
33. وەرگرا وزا خۆرێ
34. پاشمايێ جهێ پێيێ گيانەوەرەكی
35. بەلگەكێ لوولە خوار يێ ڕووەكێ (پوليپۆديوم) (بەلگێ سەرخەسێ)
36. بەلگەكێ شێوە بەرێ دەستی
37. دوو زيندەوەرێن پێكڤە پەيوەندی هەبيت
38. ڕووەكەكێ سپۆری
39. ڕووەكەكێ گەمێتی
40. تشتەكێ ڕەنگ سۆر
41. تشتەكێ زيندی
42. زيندەوەرەكێ بكارهێنەر
43. زيندەورەكێ بەرهەمهێنەر
44. تشتەكێ نە زيندی
45. زيندەوەرەكێ گەندە خۆر
46. زنجيرەكا خۆراكی يا سێ زيندەوەری
47. زيندەوەرەكێ بەرهەمهێنەرێ يەكەمی
48. زيندەوەرەكێ بخودانكەر (خانەخوێ)

# چالاکییێن تەکنیکییێن تاقیگەهی

# وەنەخشەسازی بۆ تاقیکرنێن تاقیگەهی

# (کۆمەڵا ج)

ناڤ ______________________

بەروار ____________ پۆل ____________

# ج.3 چالاکیا زەنگینکرنێ

# دانانا نەخشەی بۆ هۆکارێن زیندەیی ل دەوروبەرێن ژینگەییدا

## شارەزایی دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- سەرژمێریا کۆمەلا زیندەیی یا مەیدانی.
- **نیاسینا** کۆمەلێن زیندەیی دناڤ بکارئینانا رێکا وەرگرتنا نموونێدا دکەرتاندا.
- **دیارکرن** جۆرێ رووەکێ زال ل دەڤەرێ.
- **مەزندەکرنا** بلندیا داران
- **نەخشەکێشان** لسەر کاغەزێ، سەمتا چوونێ دسرۆشتیدا

## ماددە

- چوار پارچێن داری •
- دەزییەك ب درێژیا 15 m
- راستەیەکێ مەتری
- چاکۆچ
- نیشاندەرەکێ مەیدانی بۆ نیاسینداناا رووەك وگیانەوەران
- کاغەز
- پێنڤیس
- گۆشە پیڤەر دگەل دەزوودا (دەزی)
- بۆردەك گیرەر پێڤەبیت
- ئامیرێ ژمێرەر
- پارچەکا مقەوایێ کاغەزێ 45 cm × 60 cm
- پەرەکێ کاغەزا سپی یێ مەزن

## ئارمانج

تۆ ئەندازیارەکێ تایبەتمەندی درێکخستنا دیمەنێن سروشتیدا ویێ هەلبژارتی (ژێگرتی) بۆ دانانا نەخشەکێشانا دروستکرنا سەمتا پیادەیەکا سروشتی لسەر ئەردەکێ فرامۆشکری ل تەنیشت قوتابخانا تە ئامانجا تە ژی دانانا رێکەکا پیادەیە بۆ مێڤانان بۆ دیتنا رووەك وگیانەوەرێن بنەرەتی یێن دەڤەرێدا دنیشتە جهن بکاربینن بۆ تێك نەدانا دەوروبەرێن ژینگەیی بۆ ساناهیکرنا گەهشتنا ئەنجامێن خۆ پێدڤیە ب تەمامکرنا ڤەکۆلینا کۆمەلێن زیندەیی یێن هەمی زیندەوەران یێن هەین ددەڤەرێدا ودنیشتجهن، ب رێیا ڤان زانیاریان تو دشێی ژێکهاتنا رێکا پیادا سروشتیدا دەست بکاربی.

## پاشینە

**سیستەمێ ژینگەیی** پێکدێت ژهەمی زیندەوەران وتشتێن نەزیندی د دەڤەرەکا دیارکریدا، هۆکارێن زیندی یان زیندەوەر وسیستەمێ ژینگەیی رووەکان وگیانەوەران و وردبینە زیندەوەران کو بخوڤە دگریت. جۆرێن جودایێن زۆر ژزیندەوەران د دەڤەرەکا دیارکریدا یا کۆمەلگەهەکا زیندەیی پێکدئینن. هەمی تاکێن جۆرەکێ زیندی دکۆمەلگەیا زیندەییدا پێکدینن بۆ نموونە دکۆمەلگەیا زیندەییا دارستانێدا دبیت کۆمەلگەیا زیندەییا دارێن بەریان وکۆمەلا زیندەییا چویچکێن «دوری» وکۆمەلا زیندەییا سەرخەس تێدابیت.

زانایێن ژینگەیی هەمی رووەکێن دەڤەرەکا دیارکری ب ناڤێ رووبەرێ رووەکی ب ناڤدکەن. بۆ وەسفکرنا هۆکارێن زیندەیی یێن سیستەمێ ژینگەیی ب باشترین شێوە، یا پێدڤیە لسەر تە ڤەکۆلینێ لسەر هەر زیندەوەرەکی بکەی. هندەك ژجاران دەڤەر یا مەزنە یان ژی ژمارا زیندەوەران یا مەزنە و یا بزەحمەتە تێدا ڤەکۆلینێ لسەر هەر زیندەوەرەکی ددەڤەرێدا بتنێ بهێتە کرن. دڤان جۆرە باراندا دەڤەر دهێتە دابەشکرن بۆ چەند کەرتەکان وئەڤژی دەڤەرێن دبجویکن نموونێن تەمام یێن دەڤەرێ دنوێنن. ڤەکۆلینا هەمی تاکان دکەرتێ دیارکریدا (سەرژمێریا وان) ئەنجامدانا پیڤانان تێدا، هەژمارتنا بارستەیا وان، وتشتێن دی ژی) دهێتە کرن، ئەڤ کریارە وەرگرتنە ژنموونان ب رێکا کەرتێن هەرەمەکی (نەدرێك) دهێتە ب ناڤکرن، داتایێن کۆمکری یێن دهێن دڤەکۆلینا کەرتەکیدا ژدەرئەنجامێن پەیوەست ب کۆمەلا زیندەوەرێن تەمام یێن دەڤەرێ بکاردئینیت بۆ نموونە: ئەگەر پێنج کەرت ب رووبەرێ 10 مەترێن چوار گۆشە یێ ئامادەیە بۆ ڤەکۆلینێ. 12شەتلێن رووەکێ تالیشکێ. دوو کولی وەکی تێکرایێ ناڤەندی دهەر کەرتەکیدا تو دشێی 160 شتلێن تالیشکا کیڤی و 20 کولی د 100 مەترێن چوارگۆشە ژدەڤەرەکێ مەزندە بکەی.

پێدڤیە کۆمەلا زیندەیی دهەر کەرتەکیدا بزانی وهەژمارا رووبەرێ هەر کەرتەکی بهێتە کرن ونموونا کەرتان ژی دنوینەرێ تەمامێ دەڤەرێ بیت. بۆ هندێ دا کو رێکا وەرگرتنا نموونان یا هویر بیت.

## ئەنجامدان

**.1** گرۆپ ل وێ دەڤەرا کو مامۆستایێ تە دیار دکەت. دەڤەرەکێ بۆ شیکرنێ هەلبژێرە ب رێکا بکارئینانا راستەیەکێ مەتری وچار سنگێن داری (میخەکێن داری) وچاکۆچی ودەزی. کەرتەکی هەلبژێرە ودیار بکە ب پانیا 2 m و ب درێژیا 5 m. ئاگەهداربە ویێ هشیاربە، دەستێ خۆ نەکەیە چ رووەکێن ژەهراوی. دەستێ خۆ نەکەیە چ گیانەوەرێ کیڤی وتێزیکی وان نەبی.

**.2** ب رێکا نیشاندەرێ مەیدانی رووەکان بنیاسە. هەر جورەکی ژڤان جورە رووەکان دیار بکە. گیا رووەکێن نە داری ئەوێن جودا ژگیایی ورووەکێن راێخستی وتراشۆك وداران.

ئاگەهدارکرن: ئەگەر ژمارەکا گەلەکا مەزن ژرووەکێن بچویك هەبوون بۆ نموونە: گیا ورووەکێن نە داری ونە گیایی. تو دشێی ژمارا ڤەدگەریت بۆ کەرتەکێ دەستنیشانکری مەزندە بکەی. ب رێکا سەرژمێریا رووەکان ددەڤەرێدا ب پیڤانا 1m × 1m پاشی لێکدانا وی دگەل رووبەرێ کەرتی. داتایێن خۆ دڤی خشتێ داتاییدا تۆمار بکە.

**داتایێ تاکێن جورێن رووەکان دکەرتەکێ دیارکریدا**

| جورێ رووەکان | ژمارا گشتی یا شتلان | پیڤانێن بلندیا شەتلان | ناڤەندیا بلندیێ |
|---|---|---|---|
| گیا | | | |
| رووەکێن نە داری ونە گیایی | | | |
| رووەکێن خۆ دهەلاویسن | | | |
| دەوەن (تراشۆك) | | | |
| دار | | | |

**.3** چەند شتلەکان ژهەر جورە رووەکەکی هەلبژێرە و ب هاریکاریا راستێ مەتری بلندیا هەر ئێکێ ژوان بپیڤە پاشی ژمارا بلندیا هەر جورە رووەکەکی بکە. ئەنجامێن پیڤانێن خۆ وهەژمارێن خۆ دناڤ خشتێ داتایان یێ ل سەری تۆمار بکە. بۆ مەزندەکرنا (تێزیك کرنا) بلندیا (بەرزیا) دارەکێ . گۆشە پیڤەرەکی بگرە ب جورەکی کو لایێ کڤانەیی یێ وی بەرەڤ خوارێ بیت وەکی دوێنێ ل خوارێدا هاتیە رونکرن. تەماشەی لێڤا راستێ گۆشە پیڤی بکە بۆ دیتنا لوتکا (گۆپیتکا) دارێ. دوی دەمیدا کو هەڤالێ تە یێ چاڤدێریا گۆشە پیڤەرێ دکەت. ب هاتن وچوونێ هەتا دەزیێ شۆرکری ژگۆشە پیڤەری و ب گۆشێ 45 پلە بیت، درێژیا خۆ وئەو دوریا ژدارا خۆ جودا دکەت بێخە سەر بۆ هندێ دا بلندیا ب تێزیکی ب دەست تە بکەڤیت.



4. ژمارێن تايبەت پێن جۆرە ڕووەكەكى زێدە بكە بۆ ديارکرنا ژمارا گشتى يا شتلان دناڤ كەرتيدا.

♦ سەرژمێريا چەند شتلان دكەرتيدا تە كريە؟

5. ڕێژا سەدى يا شتلێن كەرتێ خۆ بهەژمێرە، كو تێدا جۆرە ڕووەكەكى مەزنترين ژمارەيا هەى ژشتلان بۆ هەژمارتنا ڕێژا سەدى ژى. ڤێ هاوكێشێ بكاربينە:

(300 شتلێن گيايى ÷ 500 شتل × 100 = 60% شتلێن گيايى دپولا يەكەمين يا ڤى خشتەيدا.
ئەنجامێن خۆ بنڤيسە، بەشداريا هەمى كۆمەلە چالاكيێن تاقيگەهيى دداتايێن خۆدا پشكدار بكە،
پاشى داتايێن هەر گرۆپەكا كارى دڤى خشتەيدا زێدە بكە كۆمەلا كارى بۆ ڤى خشتەى زێدە بكە.

**ڕێژا سەدييى يا جۆرێن ڕووەكێن زۆرترين ژمارە**

| كۆمەلە | جۆرێ ڕووەكێ زۆرترين ژمارە | ژمارا شتلێن جۆرێ ڕووەك زۆرترين ژمارە | ژمارا گشتى يا شتلان | ڕێژا سەدى بۆ جۆرە ڕووەكێ زۆرترين ژمارە |
|---|---|---|---|---|
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |

بەراوردييێ دناڤبەرا داپۆشراپيێ ڕووەكێ خۆ ورووبەرێ داپۆشراپيێ ڕووەكان بكە. سەرنجێن خۆ دخشتێ لاپەڕێ دهێتدا بنڤيسە.

♦ جوداهى دناڤبەرا ڕووبەرێ ڕووەكى وكەرتدا چيە؟

______

______

______

رۆخسارێ دەرەكی دەڤەرە نموونە لێوەرگرێن

| وەسفكرن | كەرت | رووبەرێ رووكی |
| --- | --- | --- |
| رووەكێن زۆرترین ژمارە | | |
| رووەكێن زۆرتر د درێژ | | |
| رێژا سەدی یا ئەردێن سیبەر یان داپۆشرایێ رووكی | | |
| رێژا سەدی یا ئەردێن رویت كو رووەك تێدا نینن | | |
| دابەشكرنا رووەكان: ( هاویەكی / نە هاویەكی) | | |

♦ وەسفا گشتیا رووبەرە رووەكیان چیە؟

**.7** دوی دەمیدا كو تو یێ مژیلی دڤەكۆلینێ وسەرژمێریا رووەكاندا، سەرنجا وان گیانەوەران ژی بدە كو تێدانە، لدویڤ وان مێرووادا بگەرێ كو لسەر رووەكان دژین ومێرووێن دفرن وبالندان ژی، سەرنجێ هەر پاشماوەیەكی بالندان یان شیردەران یان هەر پاشماوەیەكێ ژی بدە. لدویڤ وان چالاندا كو شیردەرێن بچویك دهەلقەن.

**ئاگەهدارەبە: دشیایندا نینە سەرژمێریا هویرك بۆ گیانەوەرێن گەرۆك بهێتە كرن دسیستەمێ ژینگەیدا دەمەكێ كورتدا. رێنیشاندەرێ مەیدانی بۆ نیسایا گیانەوەران بكاربینە بۆ هاریكاریكرنا تە د دیاركرنا پاشمایێ گیانەوەراندا، سەرنجا خۆ بنڤێسە دناڤ وی خشتێ داپەرێ دهێتدا.**

♦ ئەو گیانەوەرێن یان بەلگەیێن كو سەرنجا تەدای ددەمێ هەبوونا واندا چنە؟

---

---

♦ بۆچی وەسا بۆدچی كو ئەو گیانەوەرێن تە دیتین یان ئەو بەلگەیێن تە دیتین دتاییەتن ب واڤەدگەرێێن بۆ وان كو ب راستی دكەتیدا دژین؟

---

---

♦ جۆرە گیانەوەرەكی هەلبژێرە ولێكبدە بۆچی ب گیانەوەرەكێ زال دوی رووبەرێ رووكیدا دهێنە دانان؟

---

---

**وەسفێن گیانەوەران**

| گیانەوەر | وەسفا وی |
| --- | --- |
| | |
| | |
| | |
| | |
| | |

**8.**  ماددان ڤەگەرینە جهێن وان لدویڤ رێنماییێن مامۆستایێ خۆ.

**9.** لدویڤ شیانێ هەولبدە كو كێمترین پاشماوە دسەرەدانا خۆدا بۆ رووبەرێ رووەكی بجه بهێلی پشتی ڤەگەریانا تە. بەری دەركەفتنا تە ژتاقیگەهێ دەستێن خۆ بشۆ.

## شلۆڤەكرن

**10.** دگەل قوتابییێن پولا خۆدا وەكی ئێك كۆمەل (تیم) كار بكەن بۆ نڤێسینا وەسفا وێ كۆمەلگەهیێ رووەكی یێ ڤەكۆلین لسەر هاتیە كرن وەسفێ ژی دڤێ ڤالاییێدا بنڤێسە.

---

---

---

**11.** جۆرێ وی رووەكی كو زۆرترین ژمارە هەی ورێژا وی یا سەدی بێژە، ب رێكخستنەكا كێمكرنێ بۆ هەر كەرتەكی یێ كو تە ڤەكۆلین لسەر كری. دهەر رووبەرەكێ رووەكیدا، رووەكێ زال هەلبژێرە، ویاڵپشتیا هەلبژارتنا خۆ بكە.

---

---

---

---

**12.** ئەو هۆكارێن دەوروبەرێ ژینگەیی یێن جهگری دابینكەن بۆ قەبارێ زیندەی وناهێلن جۆرێ زیندەوەرەكی بگەهیتە شیانا ڤەشارتنی یا زیندەیی دبێژنێ (هۆكارێن سنووردای) ئەو هۆكارێن سنووردای چنە كو دشێن هەبن ورێژا گەشەیا ئێك ژرووەكان یان گیانەوەران سنووردای بكەت دكەرتێ تە دا؟

---

---

---

## ئەنجامدان

**13.** پالپشت ب سەرنجێن تە، ئەرێ تو دشێى وەسفا رووبەرەكێ رووەكى بكەى كو پێكهاتەكێ باش هەبيت؟ بەرسڤا خۆ ب بەلگە روونبكە.

**14.** وێنەيەكێ سەرەتايى لسەر پارچە كاغەزەكا مقەوايىٚ بۆ كەرتێ خۆ بجهبينە، ئەڤ هێمايێن هاتين ل خوارێ بكاربينە ب ئامانجا نواندنا جۆرێن رووەكان، ژمارا رووەكێن ب رێكا پشتگرێدان ب ژمارا مەزندەكرى (تێزيككرى) ببێژە. بۆ نموونە: ئەگەر 300 شتلێن گيايى ودوو دار تە سەرژمێركرن. وێنىٚ هێمان دپتريا كەرتيدا بكێشە و وێنىٚ هێما دوو داران ژى بكێشە دناڤەندە بەرزبن. لسەر هێمايا هەر جۆرە رووەكەكى بنڤيسە، نەخشەى و وێنەى رارەوێ (رێكا) پيادە دناڤ كەرتيدا بكێشە بۆ دياركرنا رووەك وگيانەوەران.




**15.** كاغەزەكا سپى يا مەزن بەرهەڤبكە (ئامادە بكە) كو رووبەرەكى ددەڤەرەكێدا دنوێنيت وێنىٚ سەرەتايى يێ كەرتێ خۆ ب ڤەگوهێزە بۆ جهىٚ وى يێ تێزيك لسەر كاغەزێ، بلا قوتابيێن پولىٚ وێنىٚ جۆرێن رووەكان ددەڤەرا بەتاڵدا بكێشن ب جۆرەكى كو رووبەرە رووەكێ وى نموونێن لێوە نەگێراى بنوێنيت. وێنىٚ وىٚ پيادەرى بكێشە ئەوێ تە دناڤ رووبەرەكێ رووەكيدا تربتيتەبەر. سىٚ رستان بداهێنە كو بشێت ب رەنگ بهێنە نڤێسين لسەر هێمان بۆ هاريكاريكرنا مێهڤانان بۆ ئاگەهدار كرن لسەر داپۆشە رووەكێ تايبەت يان ژى ژيانا گيانەوەران. ددەمەكيدا كو ئەو درووبەرێ رووەكێدا دژڤرن.

## بەرفرەهكرنا ئاسۆيێن هزركرنىٚ

**16.** ئەندازيارێن ديمەنێن سروشتى نەخشە وپلانێن وان دەڤەران دكێشن كو ژدەرڤەى ئاڤاهيانە ب هەماهنگى دگەل پێدڤيێن مرۆڤى وزيندەوەرێن دى ددەوروبەرێ ژينگەيدا ئەو ڤەكۆلينىٚ لسەر جهان دكەن نەخشێن تايبەت ب وانڤە ددانن وەكى رووەكێن دار ولێژيا روويىٚ ئەردى. ئەندازيارێن ديمەنێن سروشتى دگەل گەلەك كەساندا وەكى ئەندازيارێ بيركاريى خۆدان مۆلكان، وبسپۆريێ رێكخستنا دەڤەرێ كار دكەن ددەمەكيدا كو لسەر پرۆژەيەكێ دياركرى كار دكەن لدويف راهێنان وشارەزايێن پێدڤى بگەرە بۆ هندێ دا مرۆڤ ببتە ئەندازيارێ ديمەنێن سروشتى.

**17.** نەخشێ تاقيكرنىٚ بكێشە بۆ هندێ دا بزانى كانێ چەوا دابينكرنا جهى وپلا گەرميێ وهەبوونا ماددێن خۆراكى دئەرديدا كار دكەنە سەر كۆمەلا زيندەييا رووەكان.

ناڤ ______________________

بەروار ____________ پۆل ____________

4.ج
چالاکیا زەنگینکرنێ

# هەڵسەنگاندنا نەزیندە هۆکارێن دژینگەیێ دەوروبەردا

## شارەزایی

- پیڤانا بلەز یا پلا گەرمیێ.
- پیڤانا چەندیا شەها ئەردی.
- تاقیکرنا ژمارا هایدرۆجینی ونترات وفۆسفات وپۆتاسیومی دئاخێدا.

## دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- نەزیندە هۆکارێن دژینگەیەکێ دەوروبەری یێ دیارکریدا پێناسە بکە.
- دیارکرنا باشترین جهی بۆ دروستکرنا باخچەیەکێ گولان.

## ماددە

- راستەیەکێ مەتری
- ئامیرێ پیڤانا لەزاتیا بای ( ئەنیمۆمیتر).
- گەرمپیڤەر (ثێرمۆمیتر)
- قودیکەکا کانزایی هەردوو لایێن وێ ڕاکرین.

سنگ ( 9 دانە )
وەریسەك ب درێژیا 32 m

- گەرمپیڤەرێ ئاخێ
- پارچەکا قوماشی (پەروکی) بۆ گرتنا پارچا گەرم
- پێدڤی بۆ تاقیکرنێ لسەر ئاخێ

- کاغەزا پالاوتنێ
- شەریتا گرێدانێ یا لاستیکی
- پێنڤیسەك بۆ دانانا نیشانا هەمیشەیی
- بوتلەکێ نایلۆنی ب قەبارێ ئێك گالۆن ب باشی بهێنە دائێخستن
- ئامیرێ بلندکرنا هەلگرتنا ڕووەکێ بچویك دباخچەیدا
- بەرکۆشکا تاقیگەهێ
- دەستگۆرك
- بەرچاڤکێن پاراستنێ لاستیك

## ئارمانج

تو یێ سەرپەرشتیا باشکرنا چەند ڕووبەرەکێ ئەردی یێ قوتابخانا خۆ دکەی، ڕێڤەبەریا قوتابخانا تە حەز دکەت ڕابن ب چاندنا باخچەکێ گولان یێ بەردەوام (هەمیشەیی) دناڤ بەشەکێ (پشکەکێ) قوتابخانا تەدا، ئەرکێ تە یێ پێکهاتیە ژدابینکرنا باشترین جهـ بۆ باخچەی. بۆ ئەنجامدانا ڤێ چەندێ پێدڤیە کار بکەی بۆ هەڵسەنگاندنا نەزیندە هۆکارێن ژینگەیێ دەوروبەر دچەند جهێن گوڕەپانا قوتابخانا خۆ دا.

## پاشینە

بەشێن نە زیندەیی یێن سیستەمێ ژینگەیی دهێنە ب ناڤکرن ب «**نەزیندە هۆکاران**» کو ڕووناهی وبا وپلا گەرمیێ وئاڤ وماددێن کانزایی نەزیندە هۆکاران کو دشێن ژچەند ڕوویەکانڤە کار بکەنە سەر زیندەوەران، بۆ نموونە: کار بکەنە سەر وی جهێ تو دشێی لێ بژی، هەروەسا شیانا گەشا ڤەشارتی یا زۆربوونێ ودەربرینا بۆمایی کو دبێژنێ هۆکارێن دەوروبەرێ ژینگەهێ، کو جهگرێ قەبارێ کۆمەڵێ زیندەیی ب دەستیڤە دئینیت وناهێلیت جۆرێ زیندەوەر بگەهیتە شیانا خۆ یا ڤەشارتی، **هۆکارێ سنووردای** جهی وخۆراکی وئاڤ وکەرەستێن هێلێن دروستکرنێ بخۆڤە دگریت.

زیندەوەر ب هێزا تیرۆشکا ڕۆژێ ددەمژمێرێن ڕووناهییێدا ب ڕۆژێ ب وزێن دجودا کار دکەتە سەر وان، با کار دکەتە سەر پلا گەرمێ ورێژا هەبوونا هەڵما شەهێ دئاخێدا وگەشەکرنا ڕووەکی. ئەم دشێین لەزاتیا بای ب هاریکاریا وی ئامیری بپیڤین ئەوێ دبێژنێ: باپیڤ (**ئەنیمۆمیتەر – Anemometer**). پلا گەرمیا هەوایێ وئاخێ دوو هۆکارێن نەزیندی یێن گرنگن، هەروەسا شەهداریا ئاخێ کاریگەریەکا سەرەکی هەیە لسەر گەشەکرنا ڕووەکان. دئەردیدا ماددێن کانزایێن نە ئەندامی یێن هەین وەکی نترات وفۆسفات وبۆتاسیوم ئەم دشێین ل ڤان ماددێن کانزایی بگەڕێین ب هاریکاریا بکارئینانا ئامیران بۆ ئەنجامدانا تاقیکرنەکێ لسەر ئاخێ. ژمارا هایدرۆجینی یا ئاخێ یان ترشاتیا ئاخێ گەلەك دەما بوارێ هەبوونا ماددە کانزایێن پێدڤی بۆ ڕووەکی دیار دکەن. هەروەسا دشێین ژمارا هایدرۆجینی ب هاریکاریا ئامیری دیار بکەین بۆ ئەنجامدانا تاقیکرنێ لسەر ئاخێ.

# ئەنجامدان

**.1** تو خۆ لسەر بكارئینانا ئامیرێن پیڤانا لەزاتیا (خێرایا) بای وگەرمپیڤی ب ڕاهێنە ب ڕێكا ئەنجامدانا خواندنێن وان ل پێنج جهێن گۆڕەپانا قوتابخانا خۆ. خواندنا با پیڤەری تۆمار بكە یەكا كیلومەترێ د دەمژمێرەكێدا دهەمی جهاندا، دوو خواندنێن پلا گەرمیێ دیار بكە، ئێكێ ژوان ژبلندیا 4 cm – 5 لسەر ڕوویێ ئەردی ویا دووێ ژوان ل بلندیا ئێك مەتر لسەر ڕوویێ ئەردی دگەل بكارئینانا ڕاستەیەكێ مەتری بۆ وەرگرتنا دویراتێن تێزیككرى. ئەنجامێن خۆ دڤی خشتەیێدا تۆمار بكە.

**خشتێ 1 پیڤانێن كریاری وەكی نموونە**

| كریارا پیڤانێ | جهێ 1 | جهێ 2 | جهێ 3 | جهێ 4 | جهێ 5 |
|---|---|---|---|---|---|
| لەزاتیا بای (كم د دەمژمێرەكێدا) | | | | | |
| پلا گەرمیێ ل بلندیا (5-4 cm) پلا سەدی | | | | | |
| پلا گەرمێ ل بلندیا ئێك مەتر (پلا سەدی) | | | | | |

**.2** دگەل كۆمەڵەكا دیدا كار بكە، ب بكارئینانا وەریسی وسنگان پارچەكا ئەردی دیار بكە ب پیڤانا 5 m × 5 m ، دابەشبكە بۆ چوار دەڤەران وەكی دڤی شێوەیدا دەردكەڤیت:



**3.** ب رێکا بکارئینانا با پیڤەری، لەزاتیا بای ل دەڤەرا کاری خو تۆمار بکە. بەشداریا کۆمەڵەکا دی بکە دئەنجامێن کرداری یێن وان پیڤانێن تە ب دەستڤەئینایین، هەمی ئەو ئەنجامێن کریارێن پیڤانی دڤی خشتەیدا بنڤیسە.

**خشتێ 2 لەزاتیا بای، پلا گەرمیا داتان کو پەیوەندیا ب سیبەرێ ڤە هەیە**

| کریارێ پیڤانێ | جهێ 1 | جهێ 2 | جهێ 3 | جهێ 4 |
|---|---|---|---|---|
| لەزاتیا بای (کم د دەمژمێرەکێدا) | | | | |
| پلا گەرمیێ ل بلندیا (5- 4 cm) پلا سەدی | | | | |
| پلا گەرمی ل بلندیا ئێك مەتر (پلا سەدی) | | | | |
| پلێ گەرمیێ یا ئاخێ ل کویراتیا ——— سم (پلا سەدی) | | | | |
| چەندیا سیبەرێ | | | | |

**4.** ب بکارئینانا گەرمپیڤێ، پلا گەرمییێ یا هەوای ل دەڤەرا کارێ خۆ دیار بکە. دەستپێکێ ژبلندیا 4 cm - 5cm لسەر رویێ ئەردی، گەرمپیڤێ ئاخێ ب کویراتیا 6 cm دئەردی دا بچەقینە بۆ پیڤانا پلا گەرمییێ یا ئەردی هەتا پلێ ب جهگری دخوینی.
**ئاگەهداربە: گەلەك گەرمپیڤێ دئەدیردا نە چەقینە، هەمی پیڤانێن پلا گەرمیێ یا دەڤەرێن دی دناڤ خشتێ پێشییێدا بنڤێسە. ئاگەهداربە ژوێ کویراتیا کو تە پلا گەرمییێ لێ پیڤای.**

♦ بۆچی تە پیڤانا پلا گەرمییێ ل سێ بلندییێن جوددادا ئەنجامدا؟

---
---
---

**5.** چاڤدێریا دەڤەرا خۆ ژرویێ چەندیا وێ سیبەرا ڤەدگریت بکە: برا تێزیککری یا سیبەرێ تۆمار بکە دناڤ نەخشێ بەرێدا ب رێکا بکارئینانا ڤان وەسفان وەکی: نەبوونا سیبەرێ ژنیڤێ کێمتر، تێزیکی نیڤێ، ژنیڤێ زێدەتر، سیبەرا سەرەتایی. پشکداریێ دگەل کۆمەڵێن دی بکە بۆ تۆمارکرنا هەمان وان تێبینیان ددەڤەرێن دیدا.

♦ گرنگیا ئاگەهداربوونێ ل چەندیا سیبەرێ چیە؟

---
---

**6.** سامپلەکێ ژئاخا ئەردی دەڤەرا کارێ خۆ کۆمبکە وبکە دناڤ توێرکەکێ نایلۆنیدا و ب باشی دەرێ وی بگرە وپاشی سامپلی ببە تاقیگەهێ.

**.7** ب ڕێکا بکارئینانا کاغەزا پالاوتنێ وشەریتا گرێدانێ یا لاستیکی ئێك ژلایێن قودیکا کانزایی یا کو هەردوو لایێن وێ لابربوون بداپۆشە وەکی دوێنەیدا دەردکەڤیت.



**.8** ب ترازیێ 100 گم ژئاخا سامپلی بکێشە وبکە دناڤ قودیکێدا ئەوا تە دهەنگاڤا 7 دا بەرهەڤکری پاشی بارستا قودیکێ وئاخا دناڤدا تۆمار بکە دستوونا تایبەت ب دەڤەرا تەڤە دڤی خشتێ ل خوارێدا ب پێنڤیسێ نیشانکرنێ یێ هەمیشەیی ناڤێ قودیکێن هەر کۆمەڵەکێ ب جودا بنڤیسە وژمارا وێ دەڤەرا تە ئاخ ژێ وەرگرتی، قودیکێ بۆ دەمێ 24 دەمژمێران بێخە دناڤ فرنا هشککرنێدا کو پلا گەرمیا وێ 100 پلێن سەدی بن.

**خشتێ 3 داتایێن شها ئەردی (خاکی)**

| کریارا پیڤانێ | جهێ 1 | جهێ 2 | جهێ 3 | جهێ 4 |
|---|---|---|---|---|
| بارستە بەری هشککرنێ | | | | |
| بارستە پشتی هشککرنێ | | | | |
| بارستا وێ ئاڤا دئاخێدا هەلگرتی | | | | |
| ڕێژا سەدی یا شەهێ یا خاکی | | | | |

**.9**  ب پارچەیەکا پەڕۆکی (قوماشی) قودیکێ بگرە و ب هشیاری ژفرنێ دەربێخە وبهێلە دا سارببیت پاشی ب ترازیێ بارستێ قودیکی وئاخا تێدا بپیڤە وئەنجامێ وێ دخشتێ بەرێدا بنڤێسە.

**.10** بارستا وێ ئاڤا کو ئاخا سامپلی هەلگرتی دیار بکە ب ڕێکا بکارئینانا ڤی هاوکێشی.

بارستا قودیکێ وئاخا دناڤدا بەری هشککرنێ – بارستا قودیکێ وئاخا تێدا پشتی هشککرنێ = بارستا وێ ئاڤا کو ئاخێ هەلگرتی.

ڤێ ژمارێ ژی دناڤ خشتەیدا بنڤیسە.

**.11** ڕێژا سەدی یا شەها ئاخا تە ب ڕێکا بکارئینانا ڤێ هاوکێشێ ل خوارێ دیار بکە.

( بارستا ئاڤا دناڤ ئاخێدا هاتبوو هەلگرتن ÷ بارستا ئاخێ بەری هشککرنێ) × 100 = ڕێژا سەدی یا شەها خاکی.

ڤێ ژمارێ ژی دناڤ خشتەیدا بنڤیسە.

**.12** هەروی خشتەی تەمامبکە ب ڕێکا دانانا داتایان کو کۆمەڵێن دەڤەرێن دی ب دەستڤەئینایین.

**13.** بەرچاڤكێن پاراستنێ دانە بەرچاڤێن خۆ ودەستگۆركان بكە دەستێن خۆ، ئامیرێن تاقیكرنێ لسەر ئاخێ وەربگرە و ب هویری بنەماییێن ئێمناهییێ بخوینە——بۆ ئەنجامدانا تاقیكرنێ لسەر ئاخا هشك ژلایێ ژمارا هایدرۆجینیڤە وهەبوونا نترات وفۆسفات وپۆتاسیۆم ئەنجامێن خۆ دڤێ خشتەیدا تۆمار بكە ب رێكا وان داتاییێن ژسێ كۆمەلێن دی وەردگری.

**خشتێ 4 داتایێ ئامیرێن تاقیكرنا ئاخێ**

| تاقیكرن | جهێ 1 | جهێ 2 | جهێ 3 | جهێ 4 |
|---|---|---|---|---|
| ژمارا هایدرۆجینی | | | | |
| نترات | | | | |
| فۆسفات | | | | |
| پۆتاسیۆم | | | | |

**14.** پشتی تەمامبوونا تە ژهەمی كریارێن پیڤانێ وتاقیكرنان پشكداریا كۆمەلێن دی یێن پولا خۆ بكە بۆ گوهۆرینا داتایان دەربارێ نە زیندە هۆكارێن ددەڤەرێدا.

**15.** ئەو ماددێن لدەڤ تە لدویف رێنماییێن مامۆستاییێ خۆ بهاڤێژە.

**16.** جهێ كاركرنا خۆ پاقژ بكە ودەستێن خۆ بشۆ بەری ژتاقیگەهییێ دەركەڤی.

## شلۆڤەكرن

**17.** هەر جوداهیەك دلەزاتیا بایدا كو ئاماژە پێ كربیت دناڤبەرا هەر چار دەڤەرێن كەرتی وكەرتێ دیدا ل جهەكێ دیدا بەرچاڤ وەربگرە.

---

---

---

---

**18.** بەراوردیا شەها خاكی دناڤبەرا هەر چار دەڤەرێن كەرتێ تە وكەرتێن دیدا بكە وهەر جوداهیەكا هەبیت كو یا گرێدای بیت ب چەندیا رووناهییێ وپلا گەرمییێ یا ئاخێ ولەزاتیا بای ودابەشبوونا رووەكان روونبكە.

---

---

---

---

---

**.19** ئەنجامێن تاقیكرنێن خاكی ل دەڤەرا تە دگەل دەڤەرێن دیدا دچەوا بوون؟ هەروەسا ئەنجامێ بەراوردكرنا دگەل كەرتێن دیدا بدە؟ مفای ژجوداهایان ببینە.

**.20** ئەرێ هیچ جوداهیەك دناڤبەرا جۆرێ ڕووناهییێ ودەڤەرێن تاریدا هەبوو؟ ئەگەر جوداهی هەبوو، ڕوونكرنێ دەربارەی وێ پێشكێشبكە.

## ئەنجامدان

**.21** ب پشتگرێدان ب داتایێن تایبەت پێن تە ئەو نەزیندە هۆكار كیژكن كو دبیت ببنە هۆكارێن سنووركێش بۆ گەشەكرنا ڕووەكان ل وێ دەڤەرێ یا تە سامپلێ خۆ ژێ وەرگرتی.

**.22** ڕاسپاردێ پێشكێشبكە بۆ دیاركرنا باشترین جهـ دا ببیتە باخچەیەكێ گولان یێ هەمیشەیی.

## بەرفرەهكرنا ئاسۆیێن هزركرنێ

**.23** زانایێن خاكی ڤەكۆلینێ لسەر هەمی سەخلەتێن خاكی دكەن. سەرەتا سەرچاوە هەتا پێكهاتنا كیمیای ودابەشبوونا زانایێن خاكی دبیت كاریگەریا پەینێ لسەر جۆریەتیا خاكی تاقیبكەن یان ب بكارئینانا وان دناڤ زەڤیاندا هەڵبسەنگینن، ئێكە ژئەركێن زانایێ خاكی پەرەسەندنا بكارئینان ببیتە ئەگەرێ زۆربوونا بەرهەمئینانا خاكی، شیكرنا كیمیایی یا خاكی وپشكنینا خاكی ل ڕوانگێن هەبوونا بەكتریا وكانزایان تێدا دوو ئەركێن دینە كو دبیت زانایێن خاكی ئەنجامبدەت، هەولا ب دەستكەڤتنا ڕاهێنان وشارەزاییا پێدڤی بدە بۆ هندێ دا ببیتە زانایەكێ خاكی.

**.24** ڕووەكەكی لدویڤ حەز وئارەزویا خۆ هەلبژێرە ودیار بكە كانێ چ یا پێدڤیە بۆ گەشەكرن وزێدەبوونا وی ددەڤەرەكا دیاركریدا. ئەو نەزیندە هۆكارێن كار دكەنە سەر گەشەكرنا ڕووەكێ تە دیار بكە. ئەو ئەنجامێن تە ب دەستڤەئینایین دتابلۆیێ بەلاڤكریاندا ب هەلاویسە.

ناڤ ____________________

بەروار ____________ پۆل ____________

# ج.5 چالاکیا زەنگینکرنێ

# ڤەکۆلێنا لاگەشەسەندنا بلەز یا قەوزان

## شارەزایی

- بکارئینانا ڕووناهیە هویربینا ئالۆز.
- ئامادەکرنا سلایدەکا هویربینی یا سامپلەکێ تەڕ.
- کۆمکرن وشیکرنا داتایان.
- دارشتنا نەخشێ ڕوونکرنێ ب ستوونی.

## دەرئەنجامێن فێرکاریێ

- پشکنینا چەوانیا کاریگەریا پیسکەرێن بەلاڤەدبن لسەر قەوزان دکەت.
- دیارکرنا چەوانیا پشکداریکرنا پیسکەرێن بەلاڤەدبن دکەت، کو هۆکارێ پەیداکرنا کێشانێن دەوروبەری ژینگەیدا.
- شیکرنا کاریگەریا پلێن جودا یێن خەستیا پیسکەرێن بەلاڤەدبن دکەت ل گەشەکرنا قەوزان.

## ماددە

- بەرچاڤکێن پاراستنێ
- بەرکۆشکا تاقیگەهیێ
- پێنڤیسێ شەمایی (مۆمی)
- سێ ئامانێن تاقیگەهیێ یێن پلاستیکی
- سێ مژۆگێن پلەکری یێن پلاستیکی
- چینراوێ قەوزێن کەسك (30 mL)
- گیراوێ نترات یێ پیسبوو (30 mL)
- گیراوێ فۆسفاتێ پیسبوو ( 30 mL)
- چەندیەك ژئاڤا دەمەك ب سەردا چووی (70 mL)
- پەڕەکێ کاغەزا سپی
- گلۆپا فلۆرین
- سلایدێن شویشەی یێن هویربینی ( 3 دانە )
- تویژالێ داپۆشەر (کەڤەر Cover ) ( 3 دانە )
- هویربینا ئالۆز

## ئارمانج

وەسا دانە کو تو زانایەکێ سروشتناسی یێ تایبەتمەندی ب سیستەمێ ژینگەییا ئاڤیڤە بۆ بەرژەوەندیا بەشێ سەیرانگەیێن وەلاتەکێ دیارکری کار دکەی، ددەمێ سەرەدانا تەدا بۆ تە دەردکەڤت کو مەزنترین دەریاچا ئەڤ وەلاتە داپۆشرای ب کەفەکا ستویرا کەسك. تو دوو دل دبی کو دبیت ئاڤا ئاڤەڕوکێ پیسکەرێ تێدا بیت پشکداریا ڤێ بکەت. بۆ نموونە: ئەو پەینێن کو ب ڕێکا پەرەسەندنا ئوردووگایێ نیشتەجێ بوویێن نێزیك دهێن، ل زێدەکرنا گەشا قەوزان ددەریاچێدا بۆ تاقیکرنا منگرتیا خۆ تە بریاردا: کاریگەریا دوو پیسکەرێن بەلاڤ لسەر گەشا قەوزان تاقیبکەی کو ئەو ژی نترات وفۆسفاتن.

## پاشینە

گەشەسەندنا بلەز یا قەوزان **Algal bloom** یا پێکهاتیە ژگەشا ژنیشکەکێ ڤە بۆ چەندیەکا مەزن یا قەوزان. ل دەستپێکێ گەشا بلەز یا قەوزێن وان ب بابەتەکێ باش دانا. لێ ئەڤە ڕاست نەبوو، گوماڤ دهاوتایا سروشتی دا نینە، بەلکی دراستیدا دگیاندایە ئەوا کو ڕویددەت تێدا یا پێکهاتیە ژمژینا هەمی ئۆکسجینێ حەلیایێ دناڤ ئاڤێدا ژلایێ بەکتریاڤە ئەوژی پێکهاتیە ژکریارا دەولەمەندکرنا خۆراکی **Eutrophication** کو وەدکەت کو ڕووەك وگیانەوەر بمرن، ئەڤ کریارە ب ئاسایی پێدڤی ب هزارەها سالان هەیە، ب کاریگەریا هۆکارێن سروشتی کو دململانەکا ب هێز دایە ب ڕێکا زێدەکرنا پیسکەران بۆ دەریاچێ یان گوماڤا قەوزان ب شێوەکێ زۆر بلەز گەشێ دکەن ددەمەکیدا کو ب شێوەکێ باش ماددێن خۆراکی یێن وان پێ بکات. سەرچاوێ ماددێن خۆراکی بۆ قەوزان وڕووەکان، بۆ نموونە: نترات وفۆسفاتن. ئەگەر ب چەندیەکا کێمبن دێ دمفاداربن لێ ئەگەر هەبوونا وان ب چەندێن زۆربن ئەڤ ماددە خۆراکیە دێ بنە پیسکەر، ژبلی ڤێ چەندێ ژی دێ بنە ژەهر ودێ قەوزان کوژن. ئەڤ پیسکەرەنە ب کریار دبنە سەرچاوێ دەولەمەند بۆ ماددێ خۆراکی. نترات بریتینە ژخوێێن کو ب شێوەیەکێ بەلاڤ دپەینێدا یێن هەین وپتریا هێرایێن شویشتنێ فۆسفاتێ تێدا کو ئەوژی هەروەسا ژخوێیان پێکدهێت. نترات وفۆسفات ب ڕێکا لێچوون دئاڤا ئاڤەڕوێن مالاندا دهێنە ڤەگوهاستن بۆ گوماڤ ودەریاچان هەروەسا ب ڕێکا ئاڤا بارانان ژی دبیت

هەر دەمێ گوماڤ ودەریاچە چەندیەکا زۆر ژفۆسفات ونترات بخۆڤەگرت وی دەمی قەوزە دێ ب لەزاتیەکا مەزن زۆربن. ل دەستپێکێ قەوزە دێ کارکەن بۆ بەرهەمئینانا ئۆکسجینی. لێ دەمێ ژمارا وان زۆردبیت، ب شەڤێ و ب رێکا خانە هەناسە چەندیەکا زۆر یا ئۆکسجینی بکاردئینن، چەندیا وی ئۆکسجینێ کو بکاردئینن زێدەترە ژچەندیا وی ئۆکسجینێ ب رۆژێ درۆشنە پێکهاتنێدا بەرهەمدهێت. ب ڤێ چەندێ ژی وددویماهییێدا قەوزە کەفەکا ستویر یا کەسك پێکدئینن کو رێ ل رووناهیا رۆژێ دگریت کو بگەهیتە وان قەوزێن ل ئاستێ ل خوارێ و وان رووەکێن کو دنقومی ئاڤێنە. رووەك وقەوزە ژبەر کێمیا رووناهییێ دمرن، هەروەسا ژئەگەرێ پر وتژیاتیا (جەنجالێ). پتریا قەوزان کو ل دەڤەرێن تەنکە ئاڤێن دبنێ گوماڤێدا کۆمبووین (کەلەکەبووین) بلەز زۆربوونێ ئەنجامددەن وزێدەبوونا ژمارا بەکتریا دبیتە ئەگەرێ شیبوونا رووەك وقەوزێن مری ب ڤێ ژی ئۆکسجین دهەمان کردارێدا بکاردهێت. ب ئەگەرێ نەمانا هاوسەنگییێ دتۆرا خۆراکیدا وهاتنە خارێیەکا (دابەزینەکا) ترسناك ل ئاستێن بەرەڤ نەمان ومرنێ دچن.

## بجهئینان

**بەشێ 1 ب دەستڤەئینانا گەشەسەندنا بلەز یا قەوزان**

1. بەرچاڤکێن پاراستنێ وبەرکۆشکا تاقیگەیێ بکە بەرخۆ.

2. پینڤیسێ شەمایێ (مۆمی) بکاربینە بۆ ب ناڤکرنا هەرسێ ئامانێن تاقیکرنێ، ناڤێ کۆنترۆلکار لسەر ئێکێ ژوان وناڤێ نزم لسەر ئێکێ دی وناڤێ بەرز (بلند) لسەر ئەوێ دی بنڤێسە. هەروەسا لسەر ئامانان ڤان پیتان بنڤێسە: N بۆ نترات و P بۆ فۆسفات و PN بۆ هەردوو پیسکەران پێکڤە، لدویڤ وی پیسکەرێ کو کۆمەلا تە لسەر کار دکەت.
   ♦ چەوا ئامانێ کۆنترۆلکار دێ بۆ تاقیکرنا خۆ بەرهەڤکەی؟

3. مژۆکا پلەدار بۆ تێکرنا چەندیا تەمام ژقەوزان ومادێن پیسکەر وئاڤا کەڤن بۆ هەر ئامانەکی بکاربینە لدویڤ ڤی نەخشێ ل خوارێ. **ئاگەهداری: پشتراستبە (دلنیابە) ژپاقژیا وان مژۆکێن تو بکاردئینی بۆ قەوزە ومادێ پیسکەر وئاڤا کەڤن.**

**خشتێ 1 چەندیا قەوزە ومادێن پیسکەر وئاڤێ**

| ئامانێ تاقیکرنێ | چەندیا قەوزێن دچینرایدا | چەندیا نترات وفۆسفات یان نترات وفۆسفات پێکڤە مادێ پیسکەر | چەندیا ئاڤا کەڤن |
|---|---|---|---|
| ئامانێ کۆنترۆلکار | 5.0 mL | 0 mL | 25.0 mL |
| ئامانێ پلە نزمێ خەستی | 5.0 mL | 1.0 mL | 24.0 mL |
| ئامانێ پلە بەرزێ خەستی | 5.0 mL | 3.0 mL | 22.0 mL |

4. ئامانا هێدی و ب شێوەکێ زڤڕینی ب شلقینە. بەلێ پشتی زێدەکرنا هەمی پێکهاتان ب شێوەکێ بەردەوام ب شلقینە، سەرێ ئامانان ب قەپاغان بگرە. **ئاگەهداری: قەپاغان ب توندی نە شدینە ب شێوەکی کو هەوا نەچیتە دناڤ ئامانانیدا وژێ نە هێتە ژدەرڤە.**
   ♦ قەوزێن کەسك پێدڤی ب چنە بۆ گەشەکرنێ؟

---

♦ گرنگیا ڤەگۆهاستنا ئۆکسجینی بۆ ناڤ ئامانی وژێ دەرکەفتنا وی چیە؟

---

**.5** هەمی ئامانان دانە سەر پەرەكێ كاغەزێ یێ سپی ل نێزیك سەرچاوەكێ (ژێدەرەكێ) ڕووناهییێ بۆ دەمەكی دناڤبەرا پێنج هەتا حەفت ڕۆژان. ئەگەر دشیاندابیت ئامانان ل بلندیا دوو پێیان ل بن گلۆپا فلۆریدا بدانە وئەگەر گلۆپا فلۆری نەبوو، ئامانان دانە ل نێزیك پەنجەرێ و ب كاغەزەكا نێمچە ڕوون داپۆشە بۆ پاراستنا وێ ژ گەرما ڕۆژێ.

### بەشێ 2 تێبینیكرنا گەشەسەندنا بلەزاتیا قەوزان

**.6** پشتی دانانا ئامانان ل بەر ڕووناهییێ، هەر ب چاڤان چاڤدێریا وان بكە. یێ ئاگەهداربە ژجوداهیا ڕەنگان ولێلییێ (شێلی) دناڤبەرا ئامانەكێ وئێكێ دیدا. ڕۆژانە تێبینیێن زێدەتر ئەنجامبدە بۆ دەمێ پێنج هەتا حەفت ڕۆژان. وئەڤ خشتێ ڕوونكرنێ یێ ل خوارێ تژێ بكە دگەل وەسفەكا كورتا شێوێ هەر ئامانەكی. بازنە ل دەورێ پیتێن N، یان P یان ژ NP، دابكێشە ل ناڤونیشانێن وێ ستوینا ئاماژێ ب وی ماددێ پیسكەری یێ كۆمەڵا تە یا كاری ژێ بە پرسیارە.

### خشتێ 2 كاریگەریا ماددێ پیسكەر لسەر گەشەكرنا قەوزان

| ڕۆژ | ئامانێ كۆنترۆلكار | پلا خەستیا نزم N یان P یان NP | پلا خەستیا بەرز (بلند) N یان P یان NP |
|---|---|---|---|
| 1 | | | |
| 3 | | | |
| 5 | | | |
| 7 | | | |

**.7** پشتی تەمامبوونا تێبینیێن تە ل دویڤ پێنج یان حەفت ڕۆژان پێنڤیسەكێ مۆمی (شەمایێ) بكاربینە بۆ نڤێسینا ناڤێ ڕێكخەری لسەر سلایدەكا شویشەی وناڤێ نزمی لسەر سلایدەكا دی وناڤێ بەرز (بلند) لسەر سلایدا سێ یێ (ئەو ماددێ پیسكەرێ یێ تاقیكرن لسەر دهێتە ئەنجامدان) ئاگەهداربە: **كەرەستێن شویشەی زۆر دشكێن، مامۆستایێ خۆ ئاگەهدار بكە لسەر هەر شكەستنەكێ یان هەر بریندارببوونەكێ. ب بێی ئاگەهداركرنا مامۆستایێ خۆ پارچێن شویشێن شكەستی یان ژی ماددێن ڕێژتین كۆم نەكە، هەتا داخازیا ڤی كاری ژتە نەهێتە كرن.**

**.8** هەر ئێك ژئامانان ب شێوێ خولی وهێدی (ب هێواشی) بلڤینە بۆ دەمێ چەند خولەكان. ئاراستێ (سەمتا) خولاندنێ پێچەوانە بكە بۆ چەند جاران، سلایدەكا هویربینی (مایكرۆسكۆپی) ژسامپلەكێ تەڕ ژڤی گیراوەی بەرهەڤ بكە (ئامادە بكە).
**ئاگەهداری: دێ كار كەی بۆ دروستكرنا سلایدەكێ هویربینی بۆ سامپلێ تەڕ بۆ هەر ئێك ژهەر چار سامپلان ئەوێن ل دەڤ تە. لێ پێدڤیە چاڤدێریا سلایدان بكەی هەتا سلاید ئامادە دبیت بۆ لێنێرینێ بەری تو دەستپێبكەی بۆ دروستكرنا سلایدێن دی، چونكو دبیت هشكببن. ل وی دەمی تو تەماشەی سلایدا ئێكێ دكەی.**




**.9** سلایدێ دانە لژێر هویربینەكا ئاڵۆز ولژێر هێزا مەزنكرنێ یا بچویكدا سەرنجێ بدە (لێبنێرە). ڕابە ب ژمارتنا خانێن قەوزان یێن هەین دهەر ئێك ژچار بوارێن مایكرۆسكۆپێن جودا دا. دەستبكە ب تەماشەكرنا گشتگە هویربینی ل گۆشا سەری یا لایێ ڕاستێ و ب پێچەوانا میلێ دەمژمێرێ كار بكە وەكی ئەوا دوێنەیدا دەردكەڤیت. هەر تشتەكێ تە دیت دڤی خشتێ ڕوونكرنێدا یێ ل لایێ خارێ تۆمار بكە.

**خشتێ 3 ژمارا خانێن قەوزان**

**ماددێن پیسکەر یێن کو لژێر تاقیکرنێدا**

| ئامانێ تاقیکرنێ | ژمارا خانان/ دئێك گشتگەی هویربینیدا | | | | ژمارا خانان/ ددلۆپەکێدا کو ڕوونکرنا پلا خەستیێ بەردا نەهاتن | ژمارا سەرجەمی یا قەوزە خانان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | 1 | 2 | 3 | 4 | | |
| ئامانێ کۆنترۆلکار | | | | | | |
| ئامانێ پلە نزمێ خەستی | | | | | | |
| ئامانێ پلە بەرزێ خەستی | | | | | | |

**10.** سەرجەمێ ژمارا قەوزێن هەر چار گشتگەیێن هویربینیێ بژمێرە. کو ئەفە ژی ژمارا نێزیك یا قەوزێن تە دیێ دەتە تە کو ددلۆپەکا ڕوون نەکریدا نە کو پلا خەستیا وێ (نێزیکی 0.05 mL) بۆ هەر سامپلەکی. بۆ تەخمینکرنا (خەملاندنا) ژمارا سەرجەمی یێ ڤان قەوزان (پلا خەستی قەوزان) دئامانەکیدا قەباریێ وی ( 30 mL ) بیت. ئەڤ هاوکێشەیا ل خواریێ بکاربینە، زانیاریێن خۆ دخشتیێ ڕوونکرنێدا یێ لسەری بنڤێسە. سەرجەمێ ژمارا قەوزان = سەرجەمێ ژمارا خانێن قەوزانە دهەر چار گشتگەیاندا × 600.

**11.** مامۆستاییێ تە خشتەیەکێ وەکی ڤی خشتیێ ل خواریێ دیێ دانیت لسەر تەختیێ پۆلیێ. دگەل کۆمەلێن دی یێن پۆلیێ کار بکە بۆ ئەنجامدانا خشتیێ ڕوونکرنیێ.

**خشتێ 4 ژمارا خانێن قەوزان**

| کۆمەلا قوتابیێن پۆلیێ | ئامانێ کۆنترۆلکار | ماددیێ پیسکەریێ N | | ماددیێ پیسکەریێ P | | ماددیێ پیسکەریێ NP | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | پلا خەستی نزم | پلا خەستی بلند | پلا خەستی نزم | پلا خەستی بلند | پلا خەستی نزم | پلا خەستی بلند |
| 1 | | | | | | | |
| 2 | | | | | | | |
| 3 | | | | | | | |
| 4 | | | | | | | |
| 5 | | | | | | | |
| 6 | | | | | | | |
| 7 | | | | | | | |
| 8 | | | | | | | |
| 9 | | | | | | | |
| 10 | | | | | | | |
| تێکرا | | | | | | | |

## شلوڤەكرن

**12.** لدویڤ ڕێنماییێن مامۆستاییێ خوَ ژوان ماددێن لدەڤ تە ڕزگارببە.

**13.** جهێ كاركرنا خوَ پاقژ بكە. دەستێن خوَ بەری ژتاقیگەهێ دەركەڤی بشوَ.

**14.** لسەر ڤێ تۆڕا ل خواریێ وێنەكێ ڕوونكرنێ ب ستوونی ئەنجامێن پۆلێ ب ڕێژا ناڤەندی یا خانێن قەوزان بكێشە. ب گرێدان دگەل پلا خەستییێ وجوَریێ ماددێ پیسكەر (N، یان P، یان NP). **یێ ئاگەهداربە: بوَ هەر ماددەكێ خوَراكی ڕەنگەكێ جودا بكاربینە.**

**كاریگەریا ماددێن پیسكەر لسەر خانێن قەوزان**




**15.** كاریگەریا زێدەكرنا «نترات» لسەر گەشەكرنا قەوزان چیە؟

---

**16.** كاریگەریا زێدەكرنا «فوَسفات» لسەر گەشەكرنا قەوزان چیە؟

---

**17.** كاریگەریا زێدەكرنا هەردوو ماددێن پیسكەر پێكڤە لسەر گەشەكرنا قەوزان چیە؟

---

**18.** كیژك ژڤان هەردوو ماددێن زێدەكرین كاریگەریا وی لسەر گەشەكرنا قەوزان زێدەترە؟

---

---

**19.** کاریگەریا زێدەبوونا پلا خەستیا ماددێ پیسکەر چیە؟

**20.** کیژك ژڤان هەردوو ماددێن پیسکەر یان هەردوو ماددێن پیسکەر پێکڤە کاریگەریا وان لسەر گەشەکرنا قەوزان زێدەتر بوو دپلا خەستیا وان یا نزمدا ودپلا خەستیا بلنددا؟

## دەرئەنجام

**21.** بۆچی دبیت ئاستێن بلند ژ «نترات» یان «فۆسفات» زیانێ ب دەریاچێ بگەهینیت؟

**22.** ب پشتگرێدان ب وان ئەنجامێن تە ب دەستڤەئینایین، ئەرێ سنووردانان بۆ ڕامالّینا «نترات» یان «فۆسفات» بۆ ناڤ ئاڤان گرنگیا مەزن یا هەی؟ بەرسڤا خۆ ڕوونبکە.

**23.** ئەرێ لدەڤ تە یا ب ساناهیە کاریگەریا کریارا دەولّەمەندکرنا خۆراکی کو هۆکارێ وی پیسبوونبیت، پێچەوانە بکەین؟

**24.** ئەو سێ پێشنیارە کیژکن کو تو بشێی بێخیە بەردەستێ خودان مالّان بۆ کێمکرنا چەندیا نترات وفۆسفات ئەوا دڕێژنە دناڤ دەریاچێدا؟

## بەرفرەهکرنا ئاسۆییێن هزرکرنێ

**25.** هندەك ژماددێن پیسکەرێن بەلّاڤ کو تو دوێ باوەریێ دای زیانێ بگەهیننە قەوزان بدە نیاسین. کو دبیت ڤان ماددان ڤەگریت: ڕوونێ مەکینان، ماددێ دژی بەستیبوونێ، دندکێن خوێیێن تایبەت ب ڕێگەوبان، پاککەرێ مالّان کو «کلۆر» یا تێدا. نەخشێ تاقیکرنەکێ بکێشە ب ئارمانجا دیارکرنا پلا خەستیا ڤان ماددان کو دبیت دژە هربن بن بۆ قەوزان.

**26.** هەمی جۆرێن هێراییێن شویشتنێ فۆسفاتێ تێدا. زۆر دەڤەرێن هەین دجیهانێدا ئەو هێراییێن شویشتنێ ئەوێن فۆسفات تێدابن یێن قەدەغەکرین یان پێدڤیە وان هێراییێن شویشتنێ بکاربینی کو چەندیەکا کێم فۆسفات تێدا بیت. ل دەڤەرا خۆ بگەڕێ بۆ هەبوونا هەر ڕێگرەکی بۆ بکارئینانا وان هێراییێن کو فۆسفات تێدابن، ئەو ڕێگر چنە؟ بۆچی ئەڤ ڕێگرێن ل دەڤەرا تە هاتینە دانان؟ ڕێزنەگرتن ودەربازکرنا ڤان ڕێگران دێ یا چەوا بیت؟

ناڤ ____________

بەروار ____________ پۆل ____________

# د.1 تەكنیكیا تاقیگەهی یا میكرۆبێن نەفت شیكەر

چالاكیا بنەڕەتی

## شارەزایی

- بجهئینانا تەكنیكیا پاقژكرنێ.
- دروستكرنا مۆدێلەكێ دینامیكی یێ نەفتێ.
- دەستبسەر داگرتنا گوهۆڕینان دتاقیكرناندا.
- كۆمكرن ورێكخستنا ودانانا وێنەیەكێ داتایی.

## دەرئەنجامێن فێركاریێ

- سەحلەتێن فیزیایی یێن نەفتێ پێش وپاش كاریگەریا میكرۆبێن شیكاركرنا نەفتێ بەراورد دكەت.
- زیندەوەرێن هویربینی یێن سوود بەخش (دمفادار) یێن پاككرنا نەفتا ڕژتی دیار دكەت.

## مادده

- بەرچاڤكێن پاراستنێ
- پەینێ كیمیایی 1.5 گم
- گیراوەكێ پاقژكرنێ دناڤ دۆلكەكیدا كو ب پەستانێ دەستی كار دكەت.
- كەفیكێن كاغەزێ (كلینێكس)
- پێنڤیسێ شەمایی (مۆمی)
- چینرایی كەروویێ پەنسیلیۆم
- تویژالێ دەرێخستنا چرپا رووناهییێ (3 دانە)
- باوەشگر (حازینە)
- تویرك بۆ هاڤێژتنا پاشماێن ترسناك زیندەیی
- دەستگۆرك
- بەركۆشكا تاقیگەیی
- چینرایێ یەكتریایا (پسۆدۆمۆناس)
- ئامانێ پلاستیكی دگەل قەپاغێن وان (3 دانە)
- ئاڤا دلۆپاندی (90 mL).
- نەفتا پالاوتی ددۆلكەكێ پەستینەر دا
- دلۆپێن بۆ جارەكێ بكاردهێن (2 دانە)
- كەڤچك

## ئارمانج

وەسا دانە كو تو زانایەكێ ژینگەیی ل دەڤ كۆمپانیەكا مەزنا نەفتێ كار دكەی. ئێك ژوان كێشێن (ئاریشێن) كو پێدڤیە تو چارەسەریێ بۆ ببینی ئەوە كو دێ چەوا پاقژكرنا ژینگەیێ دەوروبەرێ وێ كو نەفتێ یا لێ ڕژتی. ب باوەریا تە هندەك ژوان ڕێكێن میكانیكی یێن نۆكە بۆ پاقژكرنێ ب لابرنا نەفتێ بكاردهێن نە دچالاكن. ژبەر هندێ حەز دكەی ڕێكەكا نوی ببینی. تە یا بهیستی كو هندەك پۆلێن میكرۆبان دشیكرنا نەفتا ڕژتیدا بكاردهێن ژبەر هندێ كار دكەی بۆ ئامادەكرنا تاقیكرنەیەكا كۆنترۆلكار بۆ هندێ دا بزانی كانێ كیژك ژڤان دوو میكرۆبێن جودا دشیكرنا نەفتێدا چالاكترە؟

## پاشینە

ب ڕێكا دەزگەهێن ڕاگەهاندنێ ڕایا گشتی زێدەتر دوان مەترسیاندا یا شارەزابووی ئەوێن هەرەشێ ل ژینگەیێ دەوروبەر دكەن ب ئەگەرێ ڕێژتنا نەفتێ. بتنێ ب ئێك گالۆنا نەفتێ دشیاندایە ب شێوێ چینەكا تەنك بەلاڤ ببیت ونێزیكی چار دوونەمان ژرووبەرێ ئاڤێ بداپۆشیت. هندەك دێ بیتە هەلم وهندەكا دی ب كارێ گەرما تیرۆژكێ دهەلوەشێت بۆ پارچێن بچویك بچویك وماددێ قورس (گران) پێكدئینیت. د دوماهیكێدا نقوم دبیتە بنێ زەریایێ، ئەڤ ماددێن قورس دێ بنە ماددێن ترسناك (مەترسیدار) كو هەرەشێ ل باڵندە وشیردەرێن ئاڤی وزیندەوەرێن دی یێن دەریایی دكەن.

دشیاندایە نەفتا ڕژتی ب ڕێكا بكارئینانا ئامیرێن میكانیكی بهێتە لابرن وەكی ئامیرێ لابرنا كەفا سەركەفتی ودروستكرنا بەندا وان (سكران). هندەك ڕێكێن دی بۆ پاقژكرنێ وەكی بكارئینانا ماددێ كیمیایی یێ پەرشو بەلاڤ وتوێنەران وسۆتاندنا نەفتێ ڤەدگریت. لێ هندەك ژزیندەوەرێن هویرك دشێن هایدرۆكاربۆنێن هەمە جۆر ژنەفتا ڕژتی ب هەلوەشینن دبیت ئەڤە باشترین بن.

وزێدەتربن شیان یێن دڵنیاكەر بیت دەربارا ژینگەهێ بۆ پاكرن ولابرنا نەفتا ڕژتی. ئەڤ میكرۆبە كار دكەن بۆ گوهۆڕینا نەفتێ بۆ خوراكی بۆ خۆ. و وەلێ دكەن كو ژەهرین نەبیت ورێكا هندێ ژێ ددەن كو ب دڵنیایی دتۆرا خوراكی یێن ئاڤیدا وەربگرن. ب بكارئینانا زیندەوەران بۆ چاككرنا تێكچوون وزیانا ژینگەیی ب (**چارەسەریا زیندەیی** **Bioremediation** ) دهێتە نیاسین.

## كاركرن

### بەشێ 1 كرنەناڤا زیندەوەرێن هویربینی بۆ نەفتێ

**1.** بەرچاڤكێن پاراستنێ، دەستگۆرك، بەركۆشكێ تاقیگەهی بكاربینە.

**2.** گیراوێ پاقژكرنێ بكاربینە بۆ پاقژكرنا ڕوویێ وێ مێزێ یا ل تاقیگەهێ ئەوا لسەر كار دكەی. بۆ ئەنجامدانا ڤێ چەندێ گیراوێ پاقژكرنێ برێژە سەر هەمی جهێن كارێ خۆ پاشی جهی ب كەفیكا كاغەزێ (كلینكسێ) پاقژ بكە، كەفیكێن كاغەزێ لدویڤ ڕێنماییێن مامۆستایێ خۆ بهاڤێژە.

♦ گرنگیا پاقژكرنا جهێ لێ كاركرنا تە چیە، بەری دەستپێكرنا چالاكیا خۆ؟

______________________________________________

______________________________________________

**3.** پێنڤیسەكێ شەمایێ (مۆمی) بكاربینە بۆ نڤێسینا پەیڤا كۆنترۆلكار لسەر ئێك ژئامانێن پلاستیكی، ولسەر یا دووێ (بەكتریا بسۆدۆمۆناس) ولسەر یا سێیێ ژی (كەڕووی پەنسیلیۆم) بنڤێسە.

**4.** ئێزیكی (30 mL) ژئاڤا دلۆپاندی بكە هەر ئێك ژئامانان كو هەر ئێك ژوان هەتا ئێزیكی نیڤەكێ دێ تژی بیت.

**5.** ئێزیكی 20 دلۆپێن نەفتا پالاوتی بكە هەر ئێك ژئامانان كو چینەكا تەنك دێ پێكئینیت.

**6.** ب كەڤچكەكی چەند دندكێن ژپەینا خۆراكدەر بكە ناڤ تێكەلێ ئاڤێ ونەفتێ، ئەڤ پەینە ژوان پۆلانە كو ڕژاندنێن ڕاستەقینە یێن نەفتێدا دهێنە بكارئینان كو دبیتە ئەگەرێ مەهاندنا نەفتێ ودابینكرنا ماددێ خۆراكی بۆ گەشەكرنا میكرۆبان.

**7.** ب ڕێكا بكارئینانا دلۆپەكا ئامادەكری بۆ یەكجار بكارئینانا 5 mL یان دوو دلۆپان ژچینراییێ (كەڕوویێ پەنسلیوم) بۆ یێن دی. لێ ئامانێ كۆنترۆلكار هیچ زیندەوەرەكێ نەكە تێدا. ئاگەهداربە: بەردەوامیا تەكنیكیا پاقژكرنێ پەیڕەو بكە دەمێ بكارئینانا بەكتریا دتاقیگەهێدا.

**8.** سەرێ ئامانان بدانێخە وچەند جارەكا سەرنشیڤبكە بۆ تێكەلكرنا نەفتێ دگەل یێن دیدا. دزەریایێدا پێل هەمان كریارێ ئەنجامددەت ب ڤێ ژی ڕێژا ئۆكسجینێ حەلیایی دناڤ ئاڤێدا زێدە دكەت.

♦ بۆچی حەزا هەبوونا ئۆكسجینێ حەلیای دئاڤێدا زێدەتر هەیە؟

______________________________________________

______________________________________________

**9.** ژماران بێخە سەر وان هێلێن كو لسەر سێ توێژالێن دەرێخەرێن چرپێ هەین ژ ( 1 – 5 )، كو ئاماژێ ب هێلا زۆر تاری دكەت. توێژالەكێ دەرێخستنا چرپێ بێخە دناڤ هەر ئێك ژئامانان بشێوەكێ كو سەرێ هێلان ل ژێر ڕوویێ ئاڤێ بیت. توێژالێ دەرێخستنا چرپێ ڕێكێ ددەتە تە بۆ پیڤانا چەندیا میكرۆبێن گەشەكرین دناڤ هەر ئێك ژئاماناندا. دەمێ میكرۆب گەشێ دكەن ئاڤ دێ شێلیبیت (لێلبیت) یان دێ نەیا ڕوونبیت. دەمێ كۆمەلا زیندە میكرۆبان مەزن وزۆر دبن هێلا كێمتر دئاڤێدا دێ بینی ئامانی هەلبگرە ب شێوەكی كو توێژالێ دەرێخستنا چرپێ ڕووبەڕوویێ تەبیت. كاغەزەكا سپی بێخە پشت ئامانی دا ببیتە پاشینە. دئاڤێدا تەماشەی ناڤا ئامانی بكە بۆ دیاركرنا هێلێن چرپێ كو ئێدی نا دەركەڤن.

**.10** تێبینیێن تە کو داتایێن ب ڕۆژا سفر (چنە) وچار ڕۆژێن لدویڤ دهێن دڤی خشتێ ڕوونکرنێ یێ ل خارێدا بنڤیسە:

**کاریگەریا زیندەوەرێن هویربینی لسەر نەفتێ**

| ڕۆژ | زیندەوەران | ڕوخسارێ گشتی یێ نەفتێ | ڕەنگێ نەفتێ | شێلیبوونا ئاڤێ (وان هێلان بژمێرە یێن ئێدی دەر ناکەڤن) |
|---|---|---|---|---|
| 0 | | | | |
| 1 | | | | |
| 2 | | | | |
| 3 | | | | |
| 4 | | | | |

**.11** ئامانان بێخە دناڤ ئامیرێ باوەشگرکرنێ کو دەرێن وان ب باشی نە دائێخستی بن دپلا گەرمیێدا (30ºC) ل دەمێ نەبوونا ئامیرێ باوەشگر. ئامانان ل جهەکێ هوین دپۆلێدا دانە.

♦ ئەرێ پێدڤیە ئامانان بێخینە دناڤ ئامیرێ باوەشگرێدا؟

___

___

___

♦ بۆچى پێدڤيە دەرڤانك ب باشى نەهێنە دائێخستن دەمێ ئامانان دكەنە دناڤ باوەشگرێدا؟

---

---

**.12** ئەو ماددێن لدەڤ تە لدويڤ ڕێنمايێن مامۆستاى بهاڤێژە.

**.13** دەڤەرا كارێ خوٚ پاقژ بكە وەكى دهەنگاڤا 2 دا هاتيە وەسفكرن. دەستێن خوٚ ب سابوونا دژە بەكتريا بشوٚ پێش دەركەڤى ژتاقيگەهێ.

**بەشێ 2 تێبينا كاريگەريا ميكرۆبان لسەر نەفتێ**

**.14** سەرنجا بوريان بدە، هەر 24 دەمژمێران جارەكێ بۆ ماوێ چوار ڕۆژان. بگەڕێ لدويڤ هەر بەڵگەيەكى بگەڕێ بۆ هەڵوەشاندنا نەفتێ وەك گوهۆڕين درەنگيدا ودروستبوونا دلۆپێن بچووكێن نەفتێ. وەهەڵوەشاندنا چينا نەفتێ بۆ پارچێن بچووك يان هەر گوهۆڕينەكێ دنەفتێدا. ودێ تێبينيا گەشا ميكرۆبان كەى ب شێوەكێ سەرەكى ل سنوورێ ناڤبەرا ئاڤێ ونەفتێدا تێبينيێن خوٚ دەربارێ شێوێ گشتيێ نەفتا هەڵوەشياى ورەنگێ وێ وشێليا ئاڤێ دخشتێ ڕوونكرنێدا ل لاپەرێ پێشيێ تۆمار بكە ڕۆژانە پشتى تۆماركرنا تێبينيێن خوٚ دەرڤانكان ب شێوێ كاتى دائێخە، ئامانان جارەكێ يان دوو جاران سەر نشيڤ بكە بۆ زێدەكرنا ئۆكسجينێ حەليای دناڤ ئاڤێدا وبۆ زێدەتر تێكەلكرنا نەفتێ دگەل پێكهێنەرێن دى ئەوێن دئامانانداهەين.

♦ ب بۆچوونا تە كيژك ژڤان زيندەوەرە هويربينانە دێ ڕابن ب هەڵوەشاندنا وێ نەفتێ ب شێوەكێ باشتر؟

---

---

**.15** ب ڕێكا بكارئينانا ئەڤێ تۆڕا ل خوارێ، وێنەكێ داتايى بكێشە كو گوهۆڕينێ دشێلێدا ديار دكەت (ژمارا هێلان كو ڤێجا دەر ناكەڤن) ئەوا دهەر ئامانەكيدا ڕوودەت پێدڤييە ئەو شێلى لسەر تەوەرێ صادى ودەم لسەر تەوەرێ سينى ديار بكەت، پێدڤييە پێنڤيسێن ڕەنگدارێن جودا بهێنە بكارئينان بۆ كێشانا چەمياىا ڕوونكرنا گەشا زيندەوەران وكۆنترۆلكرنێ لسەر هەمان وێنێ ڕوونكرنێ پشتڕاستبە ژدانانا زاراڤان كو هەر پێنڤيسەكێ ڕەنگدار ئاماژێ ب زيندەوەرەكى ددەت.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |

16. هەر گوهۆڕینەك دسیفەتێن فیزیاییدا وشێوێ دەرڤەییێ نەفتێ هەکۆ ل ڕۆژا ئێکێ ورۆژێن لدویڤدا ڕوودەت وەسفبکە. گفتوگۆییێ لسەر وان هۆکارێن چاڤەڕێکرین کو دبنە ئەگەرێ ڤان گوهۆڕینکاریان بکە.

---

17. زۆربوونا شێلیبوونێ (لێلی) ئاماژێ ب چ دکەت؟

---

18. ئامانجی ئامانێ کۆنترۆلکار چیە؟

---

19. ئامانج چیە ژدەستپێکرن ب ئاڤا دلۆپاندی ل جهێ ئاڤا بیرێ یان ئاڤا گومێ؟

---

## دەرئەنجام

20. جوداهی چیە دناڤبەرا وێ هەولێ تە ئەنجامدای دڤێ چالاکیا تاقیگەییدا دگەل کریارا پاقژکرنا نەفتا ڕژتی؟

---

21. ل دەمێ زێدەنەکرنا هیچ پەینەکێ گەشەکرنا میکرۆبان دێ چ لێ هێت؟

---

**22.** كیژك ژمیكرۆبان كار كریە بۆ هەلۆشاندنا نەفتێ ب شێوەكێ باشتر؟

**23.** ب بۆچوونا تە مفا چیە، ئەگەر هەبیت دبكارئینانا تێكەلەكێ ژزیندەوەرێن هویربینی بۆ هەلۆشاندنا نەفتێ ل جهێ بكارئینانا ئێك جۆر دڤی كاریدا؟

**24.** زانایەكێ ژینگەیی دەوروبەر دبیت بێژیت: ئەو زیانا ژئەنجامێ رژتنا نەفتێ ب ژینگەیێ دەوروبەر دكەفیت زۆر یا مەزنە. لێ زێدەكرنا پەینی ومیكرۆبان دێ بیتە ئەگەرێ زیانەكا زۆر مەزنتر! ئەڤێ بۆچوونێ شلۆڤە بكە.

**25.** تو ئەگەر بەرپرسەكێ بجهئینانا كارێ كۆمپانیایەكا نەفتێ بی وپێدڤیە تو بریارێ بدەی دەربارێ رێكا لابرنا نەفتا رژتی ژڤەگۆهێزەرەكا نەفتێ. راسپاردا تە دێ چ بیت؟ رێیازا خۆ شلۆڤە بكە.

## بەرفرەهكرنا ئاسۆییێن هزركرنێ

**26.** زانایێن زیندەوەزانیێ یێن دەریایی ڤەكۆلینێ دەربارێ پەیوەندییێ دناڤبەرا زیندەوەران وژینگەیێ دەوروبەران ل دەریا وزەریایێن لسەر ئەردی دكەن. هندەك ژزانایێن زیندەوەرزانییێ یێن دەریایی زیندە كۆمەلان وكۆمەلگەیێ زیندەوەران كو سیستەمەكێ ژینگەیی یێ دیاركری پێكدئینن، ڤەدكۆلن هندەكێن دی ژكاریگەریێن پیسبوونێ وگۆرانكاریا ئاڤ وهەوا هەمییێ وەك ژینگەیەكا دەوروبەر ڤەدكۆلن بگەریێ ل جهێ راهێنان وشارەزاییا پێدڤیدا بۆ هندێ دا مرۆڤ ببیتە زانایەكێ زیندەوەرزانیێ دەریایی.

**27.** توێژینەكا پەرتووكخانەیی (كتێبخانەیی) یان لسەر ئینترنێتێ ئەنجامبدە ب مەبەستا دیتنا كاریگەریا زیندە چارەسەریێ بۆ لابرنا نەفتا رژتی كو دبەرێدا روودای.

**28.** ڤێ تاقیكرنێ دووبارە بكە ب بێی زێدەكرنا هیچ پەینەكی. ئەنجامێ ڤێ تاقیكرنێ دگەل ئەنجامێ وێ تاقیكرنێ یا كو پەین بۆ نەفتێ زێدەكری بەراورد بكە.